ناوی کتێب: قەڵەمەکانی بەعس و موستەشارە ئەنفالچییەکان

بابەت: ئامادەکردن

ئامادەکردنی: ئەبەز گۆران

بەرگ: سەیوان سەعیدیان

مۆنتاژ: فەرمیسون عەزیز بابا

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

نۆرەی چاپ: یەکەم

ژمارەی سپاردن: ٧٥٦ی ساڵی ٢٠٠٦

چاپ: چاپخانەی رەنج

شوێن ساڵی چاپ: سلێمانی ـ ٢٠٠٦

نرخ: ٣٧٥٠ دینار

## پێشکەشە بە سەدام حسین

پاڵەوانی قەڵەمەکانی بەعس وسەرکردەی مستەشارە ئەنفال چیەکان ، ئەو پاڵەوانەی ئێستە لەمەرگدایەو هیچ کام لەقەڵەمەکانی بەعس ئامادەنین جارێکی تر ستایش نامەی بۆبنووسن و هیچ لەمستەشارەکانیش ئامادەنین ئەنفالی بۆبکەنەوە. چونکە ئیدی ئەو پاڵەوانە سەرکردەنیە تا ستایشی بکەن و کوردی بۆ ئەنفال بکەن .

## پێشەکی :

زەحمەتە توانیبێتم حەقێکی تەواوم دابێت بەم کتێبە، دیارە ئەم کتێبە گەرمن چاپم نەکردایە دڵنیابوم ڕۆژێك دەهات کەسێکی تر چاپی دەکرد، ئەمەی بەردەستان نەڕۆمانەو نەئەفسانەیەکی وەهمی، ئەمە بەشێکی بچوکی مێژووی کوردە، ئەو مێژووەی گەربەچاوێکی ڕاستگۆیانە تەماشای بکەیت لێوان لێوە لەخیانەت، ئنیسان تا نەچێتە ناو مێژووی خۆی نازانێت چ میللەتێکی بێ ئەسڵ و فەسڵین، بەدبەخترین و شەقوشڕترین مێژوو مێژووی کوردە، ئەگەر لاپەڕەیەکی جوانی مێژووت بەرچاو بکەوێت سەدان لاپەڕەی ناشیرینیش لەتەنیشتیەوە دەق کراون .

گوناهی ئەم خەڵکە ئەوەیە پێیان وایە زۆربەمان پاکین، ڕاستیەکەی دەبوایە من هەڵنەسم بە دەستنیشان کردنی قەڵەمەکانی بەعس و مستەشارە ئەنفال چیەکان، کارێك گەر جێگەی دەسخۆشی بێت ئەوەیە کەسێك هەستێت لەناو ئەو چوار ملیۆن کەسەدا کتێبێك دەرکات ناوی ئەوانەی تێدابێت کەتاکو ئێستە بەپاکی ماونەتەوە، کەدڵنیام کتێبێکی لەو جۆرە لە چەند لاپەڕەیەك تێناپەڕێت .

هەرچەند لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی بەعسم هەڵئەدایەوە کۆڵێك تەریق بونەوە دایدەگرتم بۆ کورد بوونم، ئەمەچ میللەتێکە خودایا ؟!! هەردەسەڵاتێك بێتە سەر حوکم زۆرینەی دەکەوێتە شوێنی و چاوی خۆی لەهەموو ئەو ستەمانە دەنوقێنێ کەدەرحەق

بەمیللەتەکەی دەکرێت، دەبێت لەناو میللەتێکی خێڵەکی و نەخوێندەواردا چەن قەڵەمێکی هەبوبن خۆیان دابێتە دەس ستەمکارێکی وەك بەعسەوە ئەی ئەگەر کۆمەڵگەیەکی زانستی و خوێندەوار بوایە چی دەقەوما ؟!

زۆر کەمن ئەو قەڵەمانەی توانیویانە تاکو ئێستە لەسەر مۆدێلی ووتنی راستیەکان بمێنەوە، هەمیشە خۆشم ئەوێن ئەوانەی توانیویانە خۆیان لەجەهلی ئەو هەموو نەزانینە پیاریزن، ڕاستیەکەی دەبوایە یەکەم کاری وەزارەتی ڕۆشنبیری کورد ئەوەبوایە ستایشێکی زۆری ئەو قەڵەمانەبکات کە نەبونە سێبەری دەسەلأتەکانی نەیاری کورد، بەس وەزارەتە کوردیەکە ئەمەی نەکرد گوناهێك بوو کردی، نەك هەرئەمە بەڵکو زۆربەی ئەو قەڵەمە جوانانە کەوتنە پەراوێزەوەو لەشوێنی پاکی ئەواندا قەڵەمەکانی بەعس جارێکی تر خۆیان هەڵواسیەوە بە دەسەلأتدا .

من دان بەوەدا دەنێم کەنەم توانی هەموو ئەرشیفی بەعسم دەس کەوێت تا زۆربەیان بخەمە ناو ئەم کتێبەوە، دەبێت خوێنەرانی جیلی نەوەدەکان، ئەوانەی تاکوئێستە لەهیچ خیانەتێکدا بەشدار نەبون، لەگەڵ ئەو کەسانەی کەبەپاکی ماونەتەوە بمبورن، نەك لەبەر ئەوەی حەزبکەم کەسانێك لەناو ئەم کتێبەدا ناویان نەبێت، ڕاستیەکەی ئەوەندە ناوی غەریب لەناو ئەرشیفی بەعسدا هەبون، گومانم لەباوکە نەخوێندەوارەکەی خۆشم کردبوو، دەگەڕام بزانم ئەویش شتێکی بلأو نەکردوەتەوە لەپێناوی بەعسدا .

زۆر خۆم ماندوکرد تاکو هەرچی ڕۆژنامەو بلأو کراوەی بەعس هەیە دەستم بکەوێت نەکا ناوێکم بەرچاو نەکەوتبێت و دوای ببمە شوێنی گلەی هاونیشتیمانیەکانم، بەلأم بەشێکی زۆری ڕۆژنامەوبلأو کراوەکانی بەعس لەناو کتێبخانەی گشتی هەولێرو کتێبخانەی زانکۆ لەناو براون، ئەمەش خیانەتێکی ترە بۆشاردنەوەی ئەو مەسەلانەی کە قەت کەس ناتوانێ بیان شارێتەوە، دوای بلأو کردنەوەی ئەم کتێبە زۆر سوپای ئەو کەسانە دەکەم کەدیکۆمێنتێکیان لەلایە لەسەر کەسێك و من دەستم نەکەوتوە بۆم بنێرن بۆئەوەی گەر بۆم کرا لەچاپی دووەم دا بەلێبوردنەوە بیخەمە ڕیزی ئەو ناوانە .

حەتمەن هیچ کتێبێکیش نیە جێگەی کۆمەڵێك گلەی نەبێت، وەلیّ پێم خۆشە ئەوە بڵێم من زۆر بەڕاست گۆیانە ئەم کارەم دەس پێکردوەو زۆر بەڕاست گۆیانەش ئەرکەکەی خۆم وەك ڕۆژنامەنووسێك ئەنجام داوە، وە ئەوەی پێش ئەوەدەکان بەدەگمەن دەناسم تا بتوانم چاوپۆشیان لێبکەم، ئەم قسانەشم تەنها بۆئەوەیە بڵێم ئەوەی دەستی من کەوتوە ناوی لەناو کتێبەکەمدا هەیە ئەوەشی دەستم نەکەتوە گوناهی من نیە .

پرسیاری ڕاستەقینە لێرەدا کەزەروورە بیکەم ئەوەیە ئایا ئەم کتێبە گرنگ بوو ؟ لای من وەك ڕۆژنامە نووسێك کە دەمەوێت بەشێك لەراستیەکان گەر بتوانم بخەمە ڕوو گرنگ بوو، وە دەشمویست بەم کتێبە بەدەسەلاّتی کوردو حزبە سیاسیەکان بڵێم ئیدی کاتی ئەوە هاتووە کەمێك بیر لە وانە بکەنەوە سەردەمانێك دژی میللەتەکەی خۆیان بوون و ئەمڕۆ بونەتە ئازیزی ئێوە، ئێمە ناڵێین لەژیان دەریان کەن، بەلاّم هیچ نەبێت لەبەرخاتری ئازاری ئەم ولاّتە پلەی بەرپرسیاریەتیان مەدەنیّ، کەسێك گەر بتوانیّ خیانەت دەرهەق بەخانەوادەکەی خۆی بکات کە کوردە حەتمەن شایەنی ئەوەش نیە شوێنی گرنگی بدەیتیّ، پێم ناڵێن بەسودی بەعسیەك چیە بۆ ئەمڕۆی ڕۆشنبیری کوردی؟ بەسودی ئەنفالچیەك چیە بۆ ئەمڕۆی حکومەتی کوردی ؟

دەزانم ئەم قسانەم ناگەنە گوێیە کەڕەکەی دەسەلاّت، بەلاّم نەوتنیان شەرمەزاریە بۆم، ئەگەر نووسەرکان حەقیقەتەکان نەڵێن ئیدی کیّ بیڵێت ؟!

سەیرە ڕەنگە هەرگیز مستەشارێك یان قەڵەمێکی بەعس بیری لەوە نەکردبێتەوە منداڵی پێشمەرگەیەك لەئۆردوگاکانی ئێراندا گەورەبێت وبێتەوە ئەم ولاّتە بەبیّ هەست کردن بەهیلاکی بچێت بەناو ماڵاندا بگەڕێت تاگۆڤارێکی بەعسی دەسکەوێت و قەڵەمێکی ڕەش بخاتە ڕوو، ئەمە جێگەی پێکەنینە، ئێمە منداڵی خۆمان لەدەسدا بەدەس ئازاری ڕژێمێکەوە کە هیچ گوناهێکمان بەرانبەری نەکردبوو، کەچی خەڵکانێك بەبیّ هەست کردن بەئازاری ئێمە هەرخەریکی ستایش کردنی بوون، ئەمڕۆ منیش

بەهەقی خۆمم زانی بۆلەدەس چونی منداڵی خۆمو هاوڕێکانم ئەو ستایش کەرانە بخەمە ڕوو کە بیریان لە ئەنفال کردنی گەرمیان نەدەکردەوە .

لەوانەیە لێم بپرسن بۆچی ستافی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەت خستە ناو ئەم کتێبەوە ؟ منیش وەڵامی خۆم هەیە بۆئەم پرسیارە، هەرچی وتارێك لەپێناوی بەعسدا نووسرابێت لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە نووسراوە کە ستافەکەیانم بڵاو کردونەتەوە . لەوانەیە کەسانێکی پاك هەبوو بن لەناو ستافی ئەو گۆڤارانە بەڵام ئەمەش جێگەی گومانە، هیچ مەعنای نیە تۆ ستافی گۆڤارێك بیت بڵێیت من پاکمو ئاسایی بێت بەلاتەوە بەشێکی زۆری لاپەڕەکانی لەپێناو بەعسدا پڕبکرێنەوە، لێرەدا ناچارم نمونەیەك بهێنمەوە، گۆڤاری گولآن کە هەفتەی جارێك دەردەچێت، کەس هەیە بتوانێ ببێت بەستافی نووسینی ئەو گۆڤارە بەبێ ئەوەی لەگەڵ پارتی دابێت ؟ حەتمەن نەخێر، خۆ ناکرێت یەکگرتووبیتو دەستەی نووسەرانی گۆڤاری گولآن بیت، ناشکرێت کۆمەڵی ئیسلامی بیتو لەڕۆژنامەی کوردستانی نوێ دەستەی نووسەران بیت، لەکاتێکا ئێمە لەم حاڵەتانەشدا کەئیدیعای دیموکراسیەت دەکەین ئەم کارانە قبوڵ نین، ئەی پێم ناڵێن چۆن توانیوتە لەسەردەمی بەعسدا کەچگەلەخۆی کەسی قبوڵ نەدەکرد ستافی گۆڤارێك بیتو هیچ پەیوەندیەکی حزبیت لەگەڵ بەعسدا نەبێت ؟ ئەمەپرسیارێکەو بەجێی دەهێڵین بۆئەو ناوانەی لەناو ستافی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانی بەعسدا کاریان کردوەو لەم کتێبەدا ناویان هاتوە .

هەڵبەتە زۆر بەئەمانەتەوە دەقی نووسینو ناوەکانم وەك خۆیان گواستوەتەوە، هەرکەسێك لەنووسینەکەی خۆی نمونەیەکی جەرگ بڕم وەرگرتوەو وەك خۆی بەو هەڵەچاپیانەوەش کەلە نووسینەکەی خۆیدا هەبوە گواستومەتەوە، نەم ویستوە دەسکاری بچوکترین وشەی ناو نووسینەکان بکەم، دیارە بەشێکی زۆری ناوەکانیش وتارەکانیانم دانەناوە تەنها لەبەر ئەوەی دام نەناوە ئەو بەڕێزانە لەزۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بەبەردەوام خەریکی ستایش کردنی بەعس بون، ئیدی منیش بۆ زیاتر شەرمەزار کردنیان نووسیومە پێویست بەنمونەناکات چونکە بەردەوام خەریکی

ستایشی بەعس بوە، ئەوانەی وتاریان بەنمونە نەهاتوەتەوە ڕاستیەکی پێم وایە هێندە بەعسی بون گەر سەرۆکەکەشیان بیوتایە من وازم لەبەعس هێناوەو ئیدی بەسە لەسەری مەنووسن لەدژی ئەو قسەیەش ووتارێکیان لەسەر ئەویش دەنووسی، واتە هەموو ژیانیان تەرخان بوە بۆ ستایشی بەعس‌وسەرکردەکەی .

ڕەنگە بەشێکی زۆری ئەوانەشم بلاو نەکردبێتەوە کە لەمەلەفەکانی جەنگدا شتیان بلاو بوەتەوە، لەبەر ئەوەی نووسینەکانیان هیچ ستایشێکی بەعسی تێدا نەبووە تەنها ئەوە نەبێت لەناو مەلەفی جەنگدا بابەتیان بلاوکراوەتەوە، گەر بلاویشبونایەتەوە بیانویان ئەوەدەبو کەبەزۆر نووسینەکانیا خراوەتەناو مەلەفی جەنگەوە، ڕاستیەکەی هەرکام لەو نووسینانە گەر بچوکترین ستایشی تێدا بوبێت بۆبەعس لەم کتێبەدا بلاوم کراوەتەوە .

ئەوەندەی کەپێشم کرابێت ئەو ناوانەی لەیەك دەچن لەخوار نووسینەکانەوە لەگەڵ تێبینیەکەدا ڕونکردنەوەیەکی بچوکم داوە تاکو بتوانم ناوەکان لەیەکتری جیابکەمەوە، واتە هەموو لاپەڕەیەکی زۆر بەحەزەروەوە وەك ئەمانەتێکی ڕۆژنامە نووسی کارم تێدا کردوە .

پێشم خۆشنیە لەم پێشەکیە کورتەدا بەهیچ شێوەیەك حەق بەخۆم بدەم خوێندنەوە بۆ ئەم قەڵەمانە یان بۆ ئەو مستەشارانەبکەم و بوعدی پشت نووسینەکانیان‌و حاڵەتەکانیان بخەمەڕو، چونکە لێرەدا کاری من نیەو باشترێکە بەجێی بهێڵم بۆ کاتێکی تر و بێم ئەو دیوە بخوێنمەوە کەلەناو گوتارەکاندا هەیەو دەلالەت لەدۆڕاندنی کەسیەتی کورد دەکات بەرانبەر بە دەسەلاتێك کەشایەنی ئەوەیە بەرانبەری بوەستی نەك خۆت بدەی بەدەستەوە بۆی، یان بڵێم بۆچی ئەو جۆرە مەخلوقانە دەتوانن هەمیشە دەمامکەکانی خۆیان بگۆڕن‌و چۆنیان بوێت ئاوا بەو شێوەیە لەگەڵ دەسەلاتەجۆر بەجۆرەکاندا هەنگاو بنێن؟ دیارە ئەم پرسیارە لەشوێنێکی تردا بەشێوەیەکی باشتر وەلامی دەدەمەوە، تەنها ماوە بڵێم تەمەنا دەکەم توانیبێتم کارێکی ڕۆژنامە نووسی کە ئارەزوێکی ژیانمە بەشێوەیەکی پاك ئەنجام دابێت، ئەو ماندو

بونەی ئەم فەترە زەمەنیە کێشام بەم کتێبەوەو خۆم لەخوێندنەوەی کتێبەمەزنەکان بەدور گرت نەبێتە هۆی نائومێدیم‌و خوێنەران تا حەدێك دڵخۆشم کەن کە وەزیفەیەکی باشم ئەنجام داوە، گەر خوێنەران ئەم کتێبەم لێقبوڵ بکەن ئیدی گرنگ نیەبەلامەوە لەلای ئەو مەخلوقانەی ناو کتێبەکە چۆن تەفسیر دەکرێم‌و چ بیرکردنەوەیەکی جەهەنەمیانە دادەڕێژن بۆ سڕینەوەم.

نەبەز گۆران

## ستافی گۆڤاری بەیان

## ستافی گۆڤاری ڕەنگین

## ستافی گۆڤاری ئۆتۆنۆمی

گۆڤارێك تایبەت بەلیژنەی تەشریعی .

سكرتێری نووسین : ئەحمەد عبدالقادر نەقشبەندی

### ستافی رۆژنامەی هاوكاری

خاوەن ئیمتیازوسەرنوسەر :

موسلیح جەلالی

پەیامنێران :

شێرزاد عبدالرحمان

غەفورمەخموری

ئیبراهیم هەورامانی

وەصفی حەسەن

محی الدین تاهیر

محەمەد ئوسمان

سەرگوڵ تەیمور

رەمەزان عیسا

زەكەریات محەمەد حسین

سروە قەرەنی

محەمەد هەمەوەندی

## ستافی رۆژنامەی ئاسۆ

## گۆڤارەکان

| بەشی گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ | بابەت |
| --- | --- |
| ١ — موسلح جەلالی .................... | * عێراقیەکان هەمیشە سەرکەوتوون |
| ٢ — دکتۆر کامیل بەسیر ............... | * وێژەو ئاشتیو جەنگ |
| ٣_ حەیدەر عەبدوالڕەحمان ...... | * ڕۆمانی لوتکە خاوەن خەلاتی قادسیە پێویست بەبلاو کردنەوە ناکات . |
| ٤_ محەمەد دلسۆز.................... | * گەلی عێراق پشتیوانتانە |
| ٥ _ مەولود حەمد .................... | * شەهیدانی ڕێگای سەربەرزی |
| ٦_ سەمیرە محەمەد عەلی ............ | * دەیان بابەت پێویست بەنمونە ناکات |
| ٧_ دلپاک مەحمود ................. | *پاشی سێ ساڵ شەڕ سەرکەوتنو سەربەرزی هەمیشە بۆ عێراقی مەزنمانە |
| ٨_ ئەمین شێخ عەلائەدین نەقشبەندی | * گیانی پاك |
| ٩_ نەسرین ژاڵەی .................... | * لەیادی کاروانی نەمری شەهیدان |
| ١٠_ جەلال حەسەن خۆشناو .......... | * لەیادی لەدایکبونی سەرکردەدا |
| ١١_ مەولودسورچی ......... ....... | * جەژنەکانی تەمموز |
| ١٢ _ جسیم ابراهیم دۆسکی ......... | * شەڕێ قادسیا سەدام |
| ١٣_ جەمال بەرواری ................. | * ژقادسیا سەدامیا پیرۆز |

١٤ _ حەمید عەلی ..................... * ڕوناهیەك لەسەر شەڕی عیراق‌وئێران

١٥_ عبدالستار تاهیر شەریف ....... * چەند دەرسێك لەقادسیەی سەدام

١٦_فریا عبدلله ........................ * چالاكیەكانی پارێزگای سلێمانی بۆجەنگی قادسیەی سەدام پەیامنێر لە نوسینگەی سـلێمانی

چەندین ڕیپۆرتاژ لەسەر بەعس

١٧ _بورهان عەلی سالح ................ * وەرگری خەلاتی قادسیەی سەدام، لەلایەن شێخ جەعفەرەوە سلێمانی .

## سالی ١٩٨٢ - ڕوشنبیری نویێ ژمارە ٩٤

١٨_ عبدلله ئسماعیل ................* تەمموزی شۆڕش‌و ڕاپەرین

١٩ _ مەجید حەمید .................. * سەدام حسین پالەوانی كارەكانی تەنگانەیە

٢٠ _ جەمال سلێمان قاسم ...........* توخێیبت مەكەلانە ،بۆدوژمنێ كۆرستانە

٢١ _ هێمن ئیسماعیل ...............* پیاو كوژانی سەدەی بیستەم

## بەشی گۆڤاری بەیان

٢٢_ كامەران ئەحمەد شوانی ........ * دەوری سەرۆكی فەرماندە سەدام حسین

٢٣_ نازدار كاوانی ...... ........... * هەڤالی تێكۆشەر سەدام حسین عێراقی دیموكراتیمان بۆ ...

٤٥- وەلید حەمەسەعید جاف ......* کوردستان لەچاوی سەرکردەوە

٤٦_ عەبدالوەهاب تاڵەبانی ........ * دەیان وتار پێویست بەنمونەناکات

٤٧ – مستەفا نەریمان ............ * دەیان وتار پێویست بەنمونەناکات

٤٨- عەلی ئیبراهیم دەروێش .......* خەرجیان سوتا ٢٥\ئاب

٤٩- هەوار بابەکر ................ * بۆ چاڤێتە کەکێ سەدام

٥٠- ئازاد مەحمود ........... .... * چیرۆك نووسانی قادسیە

٥١- رەفعەت گلی ...............* سەرکردەی خۆماڵی کردنی نەوت

٥٢- جەمال ئەحمەد .............* سەرکردەی هەموو گەل

٥٣ – سمکۆ عەلی ...............* تیرمەها دەسکەفتیا

٥٤-عبدالله تاهر بێسفکی ........ *ولاتێ من عێراقە

٥٥- عوسمان حەمد ............ * باهەر شەکاوەبێت ئالآی شۆرش

٥٦ – وەسفی ردێنی ............ * شۆرشا تیرمەهێ‌وپێشکەفتنا رۆشنبیریا کوردی

٥٧ -غازی ئەحمەدسعدالله .....* هەڵوێستێکی پاڵەوانانەی قادسیەی سەدام

٥٨- سگڤان عبدالکریم .........* کونگرا ئێکی یا تورەڤان و نڤیسەڤانێت

٥٩- سەلامی رەواندوز .........*شەهیدانی نیشتیمان

٦٠- حەبیب غالب کامل ........* چەندین وتار پێویست بەنمونە ناکات

٦١- ئەحمەد حەسەن ..........* چەندین وتار پێویست بەنمونە ناکات

٦٢-شاسوار بەرزنجی ...........* لەدایك بوونی سەرکردە

٦٣- نەوزاد شەفیق مەحمود ....* دوو دیمەن . بیرێکی راگوزەر

٦٤_ ئازاد شەفیق ............ * بازێك‌و دەنگ

٦٥- پرشنگ شەفیق ..........* نیشتیمانەکەم

٦٦- بێباك ................*دەیان بابەت پێویست بەنمونەناکات

٦٧ – دکتۆر نافیع ئاکرەیی ....*دەیان بابەت پێویست بەنمونە ناکات

٦٨– ئسماعیل گەیلانی .......... * خومەینیو نیازی ئیمپریالیزم

٦٩–کوردۆ محەمەد ............. * سەرۆك سەدام حسێنو دەوری سەرکردایەتی

٧٠– زۆزان مارف ............... * سەبارەت بەنوسینەوەی مێژوو

٧١– فەقێ حسێن ........ ...... * هەموو خۆشەویستی بۆسەدام

٧٢– جەلال ئەسعەد چەرمەگا ....* چەپکە نێرگزێكو مانگەشەو

## بەشی گۆڤاری ئۆتۆنۆمی

٧٣–یاسین تەهاعبداللە ........... * جەژنی سوپای سەرکەوتن

٧٤– سـەعدی بـەرزنجی .......... * دەیـان گفتوگـۆ لەسـەر بـەعس پێویـست بەنمونە ناکا

٧٥– عماد عوسمان ئەحمەد بارزانی ...* قائد شعب

٧٦–حەسەن ئەحمەد ............ .....* النزام عبدالیران ، چەن بابەتێکی تر پێویست بەنمونـە ناکـات ، بگـەڕێوە بـۆ گۆڤـاری ئۆتۆنۆمی

٧٧–سـەیفەدین اسماعیـل مـەحمود ...... * چـەند بابـەتێك لـەگۆڤاری حـوکمی زاتـی پێویـست بەنمونـە ناکـات . بگـەڕێوە بـۆ گۆڤار

٧٨– عومەر عەلی شەریف .......... * یادی پیرۆز

٧٩- سوبحی عەلی خەڵەف ..........* چەندین بابەت گۆڤاری ئۆتۆنۆمی پێویست بەنمومە ناکات .

٨٠- محەمەد مەحیەدین مەحمود .......... * چەندین بابەت گۆڤاری ئۆتۆنۆمی پێویست بەنمونە ناکات .

٨١ - فائق تاهر رەشید .................. * سەربەرزی بۆ ئۆتۆنۆمی

## بەشی گۆڤاری ڕەنگین

٨٢-خالید خۆشناو ..............* وتەو لێدوانەکانی سەرکردە قوتابخانەی گەلن

٨٣- کامیل جەمیل سورە مێری ......... * سڵاو لەسەر کردەی ڕۆژی سەر کەوتنی مەزن

٨٤-ئەحمەد زەردەشت ............ * ئاڵای عێراق هەمیشە بەرزە

٨٥- ئیبراهیم ڕەحیم بەرزنجی ................... * سەرکردەمانی

٨٦- سالار عوسمان زەنگەنە ........... * چارەسەر کردنی مەسەلەی کورد

٨٧- دکتۆر فوئاد حسین ئەحمەد ..*شۆڕشی تەموز ڕەوتی سەرکەوتنی بەردەوام

٨٨- ئسماعیل فازڵ بەرزنجی .........* جەنگە پیرۆزەکەی خۆماڵی کردنی نەوت

٨٩-ڕێزان ........ .................. * سەدام حسین بەهاری هەمیشەی عێراق

٩٠- موختار فایەق...................* لەسەدا سەد عێراقی یە

٩١- مامەند قەشقە ....................* پەیمان تازەکردنەوە بۆسەدام

٩٢- عمر حسن رسول .................* پەیمان تازەکردنەوە بۆ سەدام

٩٣- حسن حسین اللەداد ...............* پەیمان تازەکردنەوە بۆ سەدام

٩٤- عادل حسن ئەحمەد ......... * هێزی گەل‌و سەرکردەی قارەمان سەدام حسین

٩٥-شێخ عەلی شێخ ئەمین بەرزنجی ........ * پەیمان نوێ کردنەوە بۆ سەدام

٩٦- ئەنوەر میرزا ........... ..............* پەیمان نوێکردنەوە بۆ سەدام حسین

٩٧- حەمید زیرۆهەرکی ................ * پەیمان نوێکردنەوە بۆ سەدام حسین

٩٨- مەسعود کەبیر سورچی ............* پەیمان نوێکردنەوە بۆ سەدام حسین

٩٩- عسمەت دینۆ ...................* پەیمان نوێکردنەوە بۆ سەدام حسین

١٠٠- فازڵ مستەفا بەرواری ......... ....* پەیمان نوێکردنەوە بۆ سەدام حسین

١٠١- سورکێو ........................ * خۆر دەرکەوت

١٠٢- قەیس حسین حەمید ......... ...* سەدام حسین‌و سەرکەوتنی خۆماڵی کردنی نەوت

١٠٣- شەفیق مەحمود جاف ......... * ئۆتۆنۆمی بۆکوردستان دەسکەوتێکی مەزنە

١٠٤- وەصفی حسن ........... ......* دەیان بابەت پێویست بەنمونە ناکات

١٠٥- شێرزاد عبدلرەحمان ............* دەیان بابەت پێویست بەنمونە ناکات

١٠٦- موکەرەم رەشید تاڵەبانی ......* دەیان بابەت پێویست بە نمونە ناکات

١٠٧- زەکریات محەمەد حسین ........* دەیان بابەت پێویست بەنمونە ناکات

١٠٨- فتاح جاف .....................* بۆسەرۆکی فەرماندە سەدام حسین

١٠٩- سەردار جاف ............ ......* بۆ سەرۆکی فەرماندە سەدام حسین

١١٠- گەلاوێژ حەسەن ......... ........* شۆڕشی ١٧_ ٣٠ تەمموز

١١١-دڵشاد ئەیوب سعید ............ * شۆڕشی ١٧_ ٣٠ گەلاوێژ

١١٢- تاهیر حسین محەمەد جەباری ...* پەیمان نوێکردنەوە بۆ بەعس

١١٣- ئیلهام عبدالکریم ............ *شایی وشەی سەربەست‌و شایی شانازی عێراق

١١٤- سەلاح الدین عباس ........... * باراسایکۆلۆجیاو قادسیەی سەدام

١١٥- ئازاد عبدل سەمەد ............ * چوار ملیۆن مۆم

١١٦- کاوە محەمەد ئەبوبەکر ........* لەیادی لەدایك بونی سەرکردە

## بەشی گۆڤاری تەندروستی

١١٧-دکتۆر سگڤان حوسێن بامەرنی .......*یاریزانە بچوکەکان دەریان نەبرد

١١٨-ئەحمەد عبدالقادر نەقشبەندی....... * لەسایەی سێبەری سەرکردە

١١٩-سەعدون خەلیفە .................... * ئۆتۆنۆمی هیوای هەموو عێراقە

١٢٠-سیروان جاف ..................... * دەیان بابەت پێویست بەنمونەناکات

١٢١-عبدرزاق مەرعی حسێن ..............*بەبۆنەی رۆژی تەندروستی عێراق

١٢٢- دکتۆر نیهاد ئەبتەر زەنگەنە ......... * یەکیەتی نیشتیمانی لەپیلانی دوژمنان بەهێزترە.

١٢٣-محەمەد ئەمین محەمەد ئەحمەد .....*ناوچەی کوردستانی ئۆتۆنۆمی.

# ڕۆژنامەکان

## ڕۆژنامەی هاوکاری

١٣٩- سەلاح سەلیم سەیدۆك ..........* ئاوری تۆ زۆر پرشنگە بێ لەکەیە

١٤٠-سەربەست شارباژێری .............* شۆرشی بیستی نەمر

١٤١- غەفور مەخموری ................ * جەماوەری مەخمور پیرۆزبیای لەسەرۆك دەکەن بەبۆنەی جەژنی لەدایك بونیەوە .

ریپۆرتاژ.

١٤٢- سەلاح شوان ..................... * عێراقی یەك پارچە

١٤٣-بورهان هەژار ..................... * عێراقی سەربلند

١٤٤ - کەمال رەوف محەمەد...........* خۆری تەمموز بەفو ناکوژێتەوە

١٤٥ وریا سعدالله محەمەد.............. * سەرکردەو سوپاو سەرکەوتن

١٤٦-هەلمەت محەمەد................ * جەژنی سوپا جەژنی سەرکەوتن

١٤٧-وریا دلپاك ...................... * گەلی کورد ملکەچ نابێ

١٤٨-عبداللە عەباس ................ * لەبەر روناکی وتەبەنرخەکەی سەرۆکی فەرماندە

١٤٩-خەسرۆ باپیر ................... * سوپای میللی و گیانی سەرکەوتن

١٥٠-نەوزاد رەووف ................. * بوکی شۆرشەکان

١٥١-محەمەد عەلی سۆفی ........... * سوپای میللی

١٥٢-عبیدللە حەسەن عەلی دۆسکی ...* عیراقا سەرکەفتنی

١٥٣-ئیبراهیم محەمەد عامر ........ . * عیراقا من

١٥٤-سەفەر شەعبان یاسین .......... * سەرۆکی قوماندار

١٥٥-مەلاحەسەن عوسمان حەسەن ...* سلاوی شانازی بۆسوپای میللی

١٥٦-مەلامحەمەد ئەمین عبدللە سلیمان ....* سەرۆکی خۆشەویست سەدام حسین

١٥٧-مەلا ئیبراهیم عەلی حسین ............* شانازی بۆسوپای نەبەزی عێراق

١٥٨–مەلا فەتاح عبدلقادر عبدللە .......... * نەبەزی هەردوو فەیلەقی سیّ‌وحەوت

١٥٩– مەلا عبداللە محەمەد عبداللە..........* فەیلەقی سیّ‌و حەوت

١٦٠– مەلا عومەر نوری عەزیز ........* قارەمانی فەیلەقی سیّ‌و حەوت

١٦١–مەلا جەمال جەلال محەمەد ......* بەرپەرچی دوژمنان دەدەینەوە سەر جەم گوتاری ئەم مەلایانە لە رۆژنامەی هاوکاریە تاکیە بگەرێوە بۆی.

١٦٢–نەوزاد کاکە .............. * بەدڵو بەگیان لەگەڵ جەنگاوەرانی قادسیە داین

١٦٣–هیوا عبدلقادر محەمەد......* هەربژی بەسرەی جوان

١٦٤–سەکینە مەنسور حسین ...* گەورەترین شەر لەباشوری عێراق

١٦٥–عەلی محەمەد بەندی ......* عێراقی خۆشمێرن

١٦٦– بەدل محەمەد دۆسکی ...* سەرۆك‌و میللەت

١٦٧ – نەوزاد هەڵەبجەیی ......* بەند کردنی نرخی نەوت کارناکاتە سەر ئابوری

١٦٨– ساکار بەرزنجی ..........* دەیان بابەت پێویست بەنموونەناکات

١٦٩–عبداللە سالح شارباژێری ...* گفتوگۆیەك

١٧٠–ئاریان هەورامانی ..........* تەمموزی بەخشندە تەمموزی سەرکەوتن

١٧١ – هاشم حسن عەقراوی ....* دەیان بابەت پێویست بەنمونە ناکات

١٧٢–مەسعود سالّح ئامێدی ....* بەبۆنەی هەفتەی قادسیەی سەدام

١٧٣–حازم شەوکەت ............* عیراقا سەرکەفتی

١٧٤–نەجدەت مەجید ...........* تیشکێك لەسەر شۆرشی ١٧ی‌تەمموز

١٧٥–مقداد مردان دێرگژینکی ...* عێراق ولاتێ منە

١٧٦–نەسرەدین هادی ..........* من پسیارکرد

١٧٧– ئیحسان نوعمان ........* ئاخ‌و خوێن

١٩٨- سەعدی حسین رەشید ...* تەممووزی سەرکەوتنو ئاشتی

١٩٩-نەشمیە وەندی ............* ڕێزو خۆشەویستی بۆ سەرۆکی فەرماندە

٢٠٠-ئیحسان سدیق عبدالله ... * دەیان بابەت پێویست بەنمونەناکات

٢٠١- فەیسەڵ دێهاتی .........* دەیان بابەت پێویست بە نموونە ناکات

٢٠٢- ڕازاو حەمد ...............* ئاشتی ڕاستەقینە

٢٠٣- گولیزار هورمزیار..........* عێراق هەمیشە هەڵوێستێکی چەسپاوی هەیە

٢٠٤- سروە قەرەنی ............* دەیان بابەت پێویست بەنمونەناکات

٢٠٥- شیرین عە باس ............* یادی لەدایك بوونی سەرکردەی قارەمان

٢٠٦-کەریم سەردار ............ * لەپێشدا نیشتیمان

٢٠٧- عەتا خالید نەقشبەندی .. * ئەستێرەیەکی پرشنگدار داچۆڕا

٢٠٨-ڕێبوار عومەر ..............* سەرکەوتنو ڕزگار کردن لەکارەکانی توکلنا

٢٠٩-ئازاد عبدالواحید ............* ڕێبازی ئاشتی خوازانەی عێراق

٢١٠-دلاوەر ساڵەح ............. * پیشەسازیە سەربازیەکان

٢١١- قاسم ئەحمەد نوح .......* بەهلکەفتنا رۆژا باوەرێ کرنێ

٢١٢-پیرداود مەحمود ........... * چەندین شیعر پێویست بەنمونەناکات

٢١٣-عبدلخالق سەرسام ........ * کەسینە دەبێتەقەلا

٢١٤- حەمرین .................. * سەدام پێشەوامانە

٢١٥- تەحسین مەولود ...........* جەنگی قادسیەی سەدام پێشکەشە

٢١٦_ ئەحمەد محەمەد عەنایەت ....... *بیرەوەری هەشتی شوبات

٢١٧- ڕێبـوار کـەریم ..................*دەیـان بابـەت پێویـست بـە نمونـە ناکـات

ڕۆمانێکیش بۆقادسیە دیارە ئەم ناوە ڕێبوارکەریمی

هەولێر پۆست نیە .

## ڕۆژنامەی ئاسۆ

٢١٨-محەمەد مەلا ئەسعەد .............. * هاوڕێ حەسەن عەلی ئەندامی سەرکردایەتی

٢١٩-هوشیار ئەحمەد حسین ............ * سەدام حسین پیاوی بنیات نان و ئاشتیە

٢٢٠- ڕێبوار تۆفیق.................... * سەرکردەی مەزن

٢٢١-ڕەشید ئەنوەر بێتواتە ............* با ئاسۆ دڕ بەشەوەزەنگ بدا

٢٢٢- ڕەزا شوان ......................* هیوای منداڵانی کورد

٢٢٣-غەفور ساڵح .....................* هەڵوێستێك کە جێی شانازیمە

٢٢٤-شێخ محەمەد قەرەداغی ...........* لەگەڵ وجودی سەرۆکی فەرماندە

٢٢٥-خالید عەزیز کەریم ................* شەهید

٢٢٦- محەمەد پەشێو ....................* خۆشمان دەوێی

٢٢٧-محەمەد موکری ..............* سەرەك سەدام حسین و دەسپێشخەری بەردەوام

٢٢٨-خدر ئەحمەد مەحمود ........* سەرکردەو جەماوەر

٢٢٩-خالید کەریم زەنگەنە .........* ئاسۆوچەند خۆزگەیەك

٢٣٠- ئەحمەد محەمەد ئابلاخی ..............* ئاسۆی ڕۆشنبیری کورد

٢٣١- یاسین قادر بەرزنجی .....................* جەژنی شانۆو شانۆی ئێمە

٢٣٢- ئاوات ...................... * دەیان بابەت پێویست بەنمونە ناکات

٢٣٣- حەسەن جاف ..............* لوتکەی ئەڤینی دەشتاییە

## عێراقیەکان هەمیشە هەر سەرکەوتوون

**موسلح جەلالی**

ئەوەی ئەمڕۆ جێی شانازی بێ و نەك هەر لەناوچەکەدا بگرە لای هەموو گەلانی جیهانو دەوڵەتان دیارین ئەوەیە رۆڵەکانی عێراق لەژێر سایەی سەرکردایەتیە بەتواناکەیدا وەك پێنج ساڵە لەبەرەکانی جەنگدا دژی رژێمی چاو چنۆك و نالەباری ئێران بەرگری لەسەر بەستی نیشتیمانو ولاتەکەیان ئەکەن، لەبوارەکانی تری ژیانیاندا لەمەیدانەکانی کارو پێشکەوتندا هەمیشە باڵی تەقەلادان و کاری دڵسۆزانەیان لێ هەڵماڵیوە........

ئەمەلەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە عێراقیەکان پەیوەندیان بە هەموو ئەو ولاتانەی دەورو بەریان هەیە ، ئەمەش دیسان دەگەڕێتەوە بۆئەو باوەڕەی کەعێراقیەکان بەخۆیانو بە برەو پێدانی هەموو ئەو پرشنگانەیە کەرێگەی تاریکی ئادەمیزاد رۆشن ئەکەنەوە، ئێستەش کە هەروەك لەمەوبەر، سەر کردایەتی شۆڕش بەسەرۆکایەتی فەرماندە

( سەدام حسین ) دروشمی بەرپاکردنی ئاسایش بەرامبەر دەست درێژیەکانی هەڵگرت بەرامبەر بە رژێمی ئێران .

کەئەم شەڕەی رژێمی نەزانی ئێران بەسەر عێراقدا سەپاندی خزمەتی عێراقیەکانو رۆڵەکانی گەلانی عێراق ناکات و دژی هەموو خواستێکی پیرۆزو بێ گەردەو ئەوەی کەکەڵکی لێوەردەگرێت، ئیمپریالیزمو زایۆنیو کۆنەپەرستەکانن، بەلام عێراقیەکان بەرگری لەخاكو سەربەستی خۆیان دەکەن ........... تا دوای ..........

تێبینی : ئەم نووسەرە لەبەر ئەوەی وتاری زۆرە لەسەر بەعس تەنها نموونەیەکی کورتمان لەوتارێکی وەر گرد وەك بەڵگەنامەیەك، کە لە گۆڤاری نووسەری نوێ لەساڵی (١٩٨٥ ) لە ژماری ( ١٠٧ ) لاپەرە ( ٤ تا ٥ ) درێژی وتارەکەیەتی .

## وێژەو ئاشتی و جەنگ

**دکتۆر کامیل بەسیر**

بیروبــاوەڕ گــەر هــاتو لەزەمینەیــەکی ڕەســەندا ڕەگــو ڕیــشەی داکوتــابوو، وەبەشەونمی مافی نەتەوایەتیو ئارەقی زەحمەت کێشانو گیانی مرۆڤایەتی سەوز بوبو، پێویستە سەری ڕێزو قەدری بۆ دابنەوێنین .

ئەمە توێژینەوەیەکە لەسەر مەسەلەی جەنگ دیارە پێویستی بە سەرنج هەبوو، بەتایبەتی کە دەم لەبابەتێکی ئالۆزو دژوار دەدات، هەرچەندە کەلەناوجەرگەی ڕوداوەکانی جەنگی ( قادسیەی سەدام ) چاو هەڵدێنێ، بەلآم لەڕاستیەکەیدا بناغەکەی لەسەر دەیان کێشەی بیریو ڕامیاری و هونەری دێرینو هاوچەرخ بنیات نراوەو لقوپۆپی بەرەو چەند باسێکی چارەنوسی هاویشتوە، وێژەی کورد هەرچەندە لەم ڕۆژانەدا تاڕادەیەکی زۆر پێی نەکراوە سود لەجەنگی ( قادسیەی سەدام ) وەربگرێتو ئەو ڕاستییە بکا بەهەوێنی خەملآندنو گەیشتنی بە ڕادەی فەلسەفەی ئایدۆلۆجی و بیرو باوەڕی کە ناوەڕۆکی وێژەی میللەتە ستەم لێکراوەکانە .

بەلآم ئێمە لەتوێژینەوەیەکماندا بەناونیشانی ( هونەری کورتە چیرۆکی کوردیو جەنگی قادسیەی سەدام سەرنجمان بۆئەو کێشەیە ڕاکێشاوە .

هەروەها بیستو پێنج ساڵ لەمەوبەر لەهەمان ڕوانگەوە توێژینەوەیەکمان بە ناونیشانی ( خەباتی چینایەتی، لەچیرۆکی پێشمەرگەدا) بەدووبەش دەربارەی ڕۆمانە بەناوبانگەکەی دکتۆر ڕەحیمی قازی ( پێشمەرگە ) نووسیەوەو بۆچونەکانی ئێستامان بەبۆنەی جەنگی ( قادسیەی سەدام ) چەسپاند ........... تا دوای .....

تێبینی : ئەمە باسێکی درێژە لە (١٢ ) لاپەڕە پێك هاتوە لەسەر پاڵەوانیەتی جەنگی قادسیەی سەدام، ئێمە تەنها چەند نمونەیەکمان وەرگرت، لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ بلآو کراوەتەوە، ساڵی ( ١٩٨٥ ) ژمارە (١٠٧ ) لاپەڕە ٦ بۆ١٨.

## شەهیدانی ڕێگەی سەربەستی

**مەولود حەمد**

هەرلەو ڕۆژەی کەحیزبی سەرکردە حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بەسەر کردایەتی سەرۆکی لێهات و ( سەدام حسین ) شۆڕشی ١٧_ ٣٠ ی تەمموزی پیرۆزی بەرپا کردو هاتە سەر حوکم، یەکێك لەبیرو باوەڕە سەرەکیە نەگۆڕەکانی ئەوەیە کەوا دۆستی گەلانی ئازادی خوازە ........هتد

( قادسیەی سەدام ) عێراقیەتی تێکڕا کوردو عەرەبو برا کەمایەتیەکانی، لەنایابترین شێوەی وەفاو تێکەڵی لەگەڵ خاکی نیشتیماندا پیشان داو، جوانترین پەیوەندی ئەم گەلەی لەگەڵ شۆڕشەکەیدا ڕێکخست .

کورد لە ( قادسیەی سەدام ) دا وەك عێراقی هاوبەشی جەنگ بەشداری دەکات، چونکی زۆر باش دەزانێ لەم شەڕەیدا لەپێناوی سەربەرزی نیشتیمانیا خەبات دەکات ........هتد

هەزار سڵاو لەگیانی پاکی شەهیدانی ڕێگای سەربەرزی وڵات، هەزاران سڵاو لەسەرکردەی خەبات گێڕ سەرەك ( سەدام حسین ).

تێبینی : گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ساڵی ١٩٨٣ ژمارە ٩٧ لاپەڕە ٢٢.

# پاشی سیٚ ساڵ شەڕ سەرکەوتن و سەربەرزی

# هەمیشە هەربۆ عێراقی مەزنمانە

دڵپاك مەحمود

کاروان دەڕواو عێراقی خۆشەویست هەنگاوی پڕلەهیواو پێشکەوتن وسەرفرازی خۆی دەنیٚو میللەتی مەزنی عێراقیش کەسیٚ ساڵە توشی شەڕبوە سەردەکەویٚ .

گەلی کوردو عەرەب گەلی دەسکەوتو گەشەسەندنی عێراق، گەلی پەروەردەی شۆرشی ١٧_٣٠ ی تەموزی مەزن، گەلیٚ شەیدای شۆڕشەکەیو دەسکەوتو سەرکردایەتیەکەیو لەسەروی هەموویانەوە ( سەدام حسین ) . گەلی دڵسۆزی خاكو نیشتیمانو سەرکەوتن .

هەرگیز دەستەپاچەو دەستەو ئەژنۆ دانەنیشتوەو فێریش نەبوە .

هەرشەکاوەبێت ئالآی بەرزی عێراق، بەسەرکردایەتی حزبو شۆڕش و لەسەروی هەموویانەوە. سەرەکی فەرماندە بەڕێز ( سەدام حسین ) . سەرشۆڕی و زەلیلی بۆ دوژمنانی عێراق ..........

تێبینی : گۆڤاری ڕۆشنبیری نویٚ ساڵی ١٩٨٢ ژمارە ٩٩ لاپەڕە ٧ .

## گیانی پاك

ئەمین شێخ علاالدین نەقشبەندی

هەروەها هەموو مان ئەو وتەگرنگەی سەرۆك ( سەدام حوسێن )مان لەیادەو لەگوێمانـدا ئەزرنگێتـەوە، کـەوتیان شـەهیدەکان لەهـەمووومان بـەڕێزترن، درودی ئێمەش لەگەڵ ستایشی بێ پایانـدا بۆئەوانـەی کەبە بەخت کـردن گیـانی خۆیـان پەخشی و شورەێکی پتەویان بەهەر چوار دەوری وڵاتەکەماندا کێشاوە بۆپاراسـتنی وڵات و دانیشتوانی وڵات لەدەست دەست درێژکەران .
بەڕاستی کام سەخی ئەتوانێ سەرمایێك ببەخـشێت کەبەنرخترببێت لـەگیان، کـام خەبات گەورەترە لەگیان بەختکردن،کەواتە: درودی خواتان لەسـەر ئـەی شـەهیدان ئەی قارەمانانی ڕێگەی پاراستنی وڵات، لەپۆزەی چلکنوپیسی گورگی دوژمن .
دوژمنی داگیرکەر هەرچەن لاشەتان وەکو هەموو مردوێـك خرابێتـە گڵـەوە، بـەڵام یاتان هەمیشە والەناو دڵ و دەرونی هەموو عێراقێکی بەشەرەفی دڵسۆزدا، بەڕاستی ئێوە لەهەمووومان مەزنترو بەڕێزترو سەربەرز ترن .

تێبینـی : ئـەم بـەڕێزە چـەندین وتـاری هەیـە لەستایـشی بەعسدا و دژی ئێـران، ئـەم وتارەشی گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ساڵی ١٩٨٣ ژمارە ١٠٠ لاپەڕە ١بۆ ٢ .

## لەیادی کاروانی نەمری شەهیدان

نەسرین ژاڵەی

شەهید گیان هیچ خامێك ناتوانێ شتێك دەربارەت بنووسێ، زمان نازانێ لەبارەتەوە بدوێ، هەموو شتێکت بۆکەمە، بەڵام ئەبێت بەوەندە ڕازیبیت کە تێکۆشەر ( سەدام حسین ) ئەڵێ (( ئێوە لەگشتمان پیرۆزترو بەنرخترن ))
ئێوە لەدڵ و دەرونی ئێمە ئەژین، ئەو چەپکە گوڵەی ئەیخەنە سەر گۆڕت، بەدڵێکی فراوان، باوەشی بۆبکەرەوە، پێشکەشی تۆ دەکرێت، لەو کەسانەی کەتۆ بەرگریت لێکردون، بەخوێنی گەشت .........هتد
کاتێ کەدێینە لاتان و سەرت لێدەدەین پێمان بڵێ و فێرمانکە، ئەم ڕێگایە چەند خۆشە کەتۆ گرتوتە بەر، تاکو ئێمەش بەڵێنت پێبدەین و سوێندت بەکوردستان بۆ بخۆین ئەوا هاتین و ئێمەش لەدوای تۆین .

تێبینی : گوڤاری ڕۆشنبیری نوێ ساڵی ١٩٨٣ ژمارە ١٠٠ لاپەڕە ٦.

## لەیادی لەدایکبونی سەرکردەدا

**جەلال حەسەن خۆشناو**

ئەگەر بمانەوێت لەکەسایەتی سەرۆکی فەرماندە و پێشەوای سەرکەوتن ( سەدام حسین ) بدوێین و لەگشت لایەنەکانی وەکو فەرماندەی مێژوویی دەگمەن فەرماندەیەك کەلەناو میلەتەوە پێ گەیشتوە وەهەروەها لەناو جەرگەی شۆڕشەوە وەکو کانی یە ئاوێك دەربووە .

سەرۆك تەنیا سەرکردەی ئەم گۆڕانە لەسەر کۆمەڵ و مرۆڤی عێراقی و پەیوەندیەکانی پشکنێنەری سەرەکی لە شوێنی مێریەوە نیە، بەڵکو فەرماندەیەکە سەرۆکایەتی ئەم گۆڕانە دەکات و ئەم شۆڕشە لەهەموو لایەنەکیەوە بەشێوەیەکی سەرکردایەتی دیاری کرداو بەڕێوە دەبات .

لێکۆڵینەوە لەهاتنی سەرۆکی مەزن ( سەدام حسین ) کردەیەکی ئاسان نیە نەك لەبەر گرێدراو گرانی باسەکە بەڵکو لەبەر زۆری کەلێن و تێکەڵاو بونی ئەم هەموانە .... تادوای

تێبینی : گۆڤاری رۆشنبیری نویَ سالَی ١٩٨٥ ژمارە ١٠٦ لاپەرە ٢

## جەژنەکانی تەمموز

مەولود سورچی

حەڤدە سالْ لەمەوبەر پاش سەدان سالْی ئێش و ئازارو نەهامەتی و ژێر دەستی شالاَوی بێگانە، دوای سەدان سالْی هەلَمژینی تالاَوی تاریکی و دواکەوتن و ئەشکەنجەو بیْ هیوایی گەلی مەزنی عێراق، شۆڕشی ۱۷_ ۳۰ ی تەمموزی ۱۹٦۸ کەحیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست سەرکردایەتی کردو ڕاپەڕاند و سەرکەوتوانە تەقیەوە .
هاتەمەیدان و نیشانەیەکی دیاری لەمێژوی گەل و ولاَت و نەتەوەی عەرەبدا دروست کرد .هتدا ......
بەم جۆرە شۆڕشی سەرەك ( سەدام حسین ) ساغی کردەوە کەلەهەموو دوژمنان و لەهەموو نەهامەتی و تەنگانەیەکدا بەهێزترە، شۆڕشەکە لەتەرزدا نویْ یە بۆکامەرانی مرۆڤ و پێشکەوتنی مرۆڤ .

تێبینی : ئەم نووسینە باسێکی درێژە لەسەر دروست بونی بەعس، لەڕوی مێژوی و ستایشەوە . گۆڤاری ڕۆشنبیری نویْ ، سالْی ۱۹۸٥ ژمارە ۱۰٦ لاپەڕە ۱۱ بۆ ۲٤ .

## شەش سالێ بورین لسەر شەڕی مەیی پاراستنێ
## شەڕی قادسیا سەدام

**جسیم ابراهیم دۆسکی**

هندی باشترە سەرکفتن مزنترە گەلی عیراقێ بەرف سالا شەشێ ڤەچولگەل شەرێ مەیێ پیرۆز شەرێ (قادسیا سەدام)و عیراق موکوم ترەو بهێنترە ژهەر دەمەکی و ڤان پێنج سالێت بوری گەلی عێراقێ پتر ئێك گرتی بوو کرە شانەکا ب ئیکەڤە مایی‌و دەست ژ ئێك بەرنە داو بەرڤ چوتا سالا شەشێ ژ شەرێ وبسەر بلندی بوهەمی عیراقا بوری .

ژدەمی بنەجیهکردنا روحا سەرکەفتنێ و گەهشتنە سەرکەفتنا دیماهی، یاکو دوژمنا پێ زانێ بەری هەڤالا.

ئودیاربونا بنەجیهکرنا روحا سەرکەفتنی ئەوبوکونەهێلای خومەینیزفرینا لەشکری عیراقێ بوتوخیبێ بخوبکار بینیتبو موکوم کرنابنگەهیت خوێیت لەشکەری، ژ داخازیا رەنگی نوی یێ شەری کارکرنا هاو ولاتێت عێراقێ .........
تادوای

تێبینی : گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ سالی١٩٨٥ ژمارە ١٠٨ لاپەڕە ١٢ .

## چەند بەر پەڕەك

## ژقادسیا سەدامی یا پیرۆز

جەمال بەرواری

دەمێ جەنگا (قادسیا سەدامی) دچیتە دناف سالا هەفتێدا یا پێدڤیە ئەم هندەك بەریەرا ژ وان هەفت سالێت بەردەوام ژ سەرکەوتنا ڤەدین، ل وانداستانێت میرانێ وزیرەکێیو پالەوانێ ئەوێت مێرخاسا عێراقێ تومار کرین ل هەمی بەرۆکێت شەری ول درێژاهیا هزارو دووسەد کیلۆمەتر .

هەروەکی سەرۆکێ ( سەدام حسین ) دگووتاراخودگوتی ب هەلکەفتنا شورشا ۱۷–۳۰ی تیرمەهێ دەمێ گووتی : دەست درێژا فارسا لسەر عیراقێ نەکوبتەنێ یا ئێرانێ بوو بەلێ پیلانا زایۆنیزمێ و ئیستعمارێ بوو وان دڤیا تیرۆژکێت ئاقلی وتێ گەهشتێ دناف دلی هەوەدا بەرزەکەن .

ڕژێما ئێرانێ ئاگرێ شەڕێ دژی ولاتێ مە هەل کر ل چاری ئیلونێ ل سالا ۱۹۸۰ ............ تادوای

تێبینی : گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ سالی ۱۹۸٦ ژمارە ۱۱۱ لاپەڕە ۱٦ .

## روناهیێ یەك ل سەر شەڕێ عیرقیێ ئیران

**حەمید عەلی**

ولسەر هەندێ را سەرۆكی قوماندار ( سەدام حسین ) گووتی مەچەنگ دگەل ئیرانی نەڤێت، بریارا مە جەنگك نینە بەلێ مە دڤیت هەمی پارچەكی عەردی عیراقی ڤەگرینە ڤە ئەوێ فورسان بری ئەم تەماعیا عەردێ ئیرانێ ناكەین .
ئەو رۆژا عەردێ داگیر كریێ ڤەگریا ڤە لسەر دەستێت هێزێت چەكدارێت عێراقێ زین القوس وسیف سعد ب قوماندراریا قوماندارێ پالەوان ( سەدام حسین ) و لبن ئالایا وی داكوببیتە رۆژەك مێژوی د جەركو هونافێت میللەتێ عێراقێ یێ هێژا .
ولسەر ڤێ بنیاتێ حكومەتا ئیرانێ تفاقا ٦ ئاداری سالا ١٩٧٥ و پرۆتوكولێت د گەل ژێچ دویر كەفت ئەو ژی ژ بەر نەقەدرگرتنا تێكەلاهێت جیرانەتێ و دەست درێژیا د ناف سەروبەرێت عێراقێ بێت نافخوی ونەدانا ......... تادوای

تێبینی : گوڤاری ڕۆشنبیری نوێ سالی ١٩٨٦ ژمارە ١١١ لاپەڕە ٢٦ بۆ ٣٢.

## چەند دەرسێك لەقادسیەی سەدام

عبدلستار تاهیر شەریف

لەم چەند دێرەی خوارەوە کەبەراوردی هەندێ لەلایەنەکانی ( قادسیەی سەدام ) دەخەینە ڕوو وەك شریتێکی سینەمایی ئەو گەندو پیسانەی لەئەنجامی شەپۆلەکانی دەریاکانی جەنگەکە کەوتونەتەوە کەنارو، دەریاکان بەو پانو پۆریانەوە جێگایانیان نەکردوەتەوە. ............. هتد

یەکێك لەو ڕاستیانەی تری ( قادسیەی سەدام ) خستویەتیە ڕوو لە پرسیارەکەی سەرۆك کۆمار تێکۆشەر ( سەدام حسین ) دەر ئەکەوێ کە پرسیارێك لەوانە دەکەین کەوا کەوتونەتە سەر هێڵی لادانو نۆکەری بێگانەن بەشێوەیەکی ڕاستەو خۆ لەو کەسانەی ناویان لەخۆیان ناوە ( معارزە ) و لەسەر سفرەی بێگانە ئەژین لەدەرەوە ....... تادوای

تێبینی : گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ساڵی ۱۹۸۲ ژمارە ۹۳ لاپەرە ۸ .

## تەمموزی شۆڕش و ڕاپەڕین

عبدالله ئسماعیل

لێرەدا دامو دەزگا ئیستیعماریەکان دیسان توانیان چەند نۆکەرێکی خۆیان لەژێر پێچەو پەردەی نەتەوەپەروەری درۆزنانەدا شاردرابونەوە، بەنیازی ئەوە بخزێنە ناو شۆڕشەوە کەلەناوەوە کنەی تێدابکەن‌و بەرەبەرە ناکۆکی بخەنە ناو ریزەکانی یەوە تا لەئەنجامدا بەمەردەکەی پاش چواردەی تەمموزی سالّی ١٩٨٥ ی ببەن .
بەلاّم قوریان بە کۆیلایەتی ئاگایان لەوە نەبو یان خەیالّی بەن کێشانیان وەگێلی کردبون نەیانـدەزانی کـە شۆڕشـگێڕێکی هەلّکـەوتووی وەکـو ( سـەدام حـسین ) کەلەبۆتـەی خەباتـدا قـالّ بوەتـەوە ئەگـەر لـەبن سـەد پێـچەو پەردەشـدا خۆیـان شاردبێتەوە هەر دەیان دۆزێتەوە.

تێبینی :گۆڤاری رۆشنبیری نوێ سالّی ١٩٨٣ ژمارە ٩٨ لاپەرە ( ٥ بۆ ٧ ).

# سەدام حسین پاڵەوانی کارەکانی تەنگانەیە

**مەجید حەمید**

لەناو ئەم داخانەدا دەرکەوت هاوڕێ ( سەدام حسین ) تێ ئەکۆشا بۆئەوەی ئەو کەلێنە چاك بکات کەلەپاش ١٨ ی رەشی تشرینی ساڵی ١٩٦٣ پەیدا بوو تاکو حزب کۆك بکاتەوەو ئەو تەقەلایەشی کەماندوبونی بۆنیەو ئەو ئاگاداریو بەشوێندا چونە رۆژانەیەی بەدوای کاروباری حزب .

هاوڕێ تێکۆشەر ( سەدام حسین ) بەنهێنیو گرجو گۆڵی خۆی بۆ کۆکردنەوەی حزبیەکانو سەردانی شانە حیزبیەکان تەرخان کرد . .........هتد

لەمەودوا سەرکردایەتی نەتەوەی پەیوەندی بە هاوڕێ ( سەدام حسین )ەوە کردوو داوای لێکرد کەبەنهێنی بچێتە سوریا ....... تادوای

تێبینی :گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ساڵی ١٩٨٤ ژمارە ١٠٢ لاپەرە ٣.

## تو خیبێت مه کەلانە بۆ دوژمنان گۆرستانە

جەمال سلێمان قاسم

سەری کورێت میللەتێ عێراقیێ دیێ هەیە بلند بیت و ئالایەت سەرکەوتنێ دیێ هەر دەدەست خۆش مێرۆ و مێرخاسێت عێراقی دا بن ، ل ژێر سێبەرا سەرۆکێ قارەمان ( سەدام حسین ) وتوخیببیت عێراقیێ دیێ هەر مینکەلا کەلایەکا موکم و هەر کەسی قوچانیێ دگەل دیواریێ عیراقیێ بکەت دیێ مەژی دگوهاداهێتە خار .

سەرکەتن هەمی دەما بەهرا هێزیت مەێت قارەمانە . ومردنو سەر شوری بۆ جەمبازو سحریەندایە ل قومو تەهران .

نەمری بۆ شەهیدێن وەلاتی .ئەو شەهیدێت گیانی خۆ گوریئاخا عێراقیێ کرین . شەهیدێن ( قادسیا سەدامیێ ) .

تێبینی : گۆڤاری ڕۆشنبیری نویێ سالێ ١٩٨٤ ژمارە ١٠٢ لاپەرە ١٥ .

## دەوری سەرۆکی فەرماندە

## سەدام حسین لەسەرکەوتنی مەزندا

**کامەران ئەحمەد**

ئەو جەنگە لەخۆ بەرگرییەی گەلی عێراق بەسەرۆکایەتی سەرۆکی تێکۆشەر ( سەدام حسین ) و بەبازوی هێزە چەکدارە نەبەردەکانی ماوەی هەشت سالی رەبەق، دژ بەدرندەترین و کینە لەدڵو کەللە رەق ترین دوژمن لەسەردەمی نوێدا ئەنجامیان داو، تێیدا بەزوبانی بەتینیو بەسنگی فراوانو بەقوربانی دانی ئەوتۆ بەرگریان لەخاکو ئاو ئاسمانو سەربەرزیو شکۆمەندیو دەسەلاتی نیشتیمانونەتەوە کرد .

بۆهەموو جیهانیان چەسپاند ئەو گەلەی سەرۆکێکی داناو تێکۆشەرو هوشیاری وەك سەرەك ( سەدام حسین ) سەرکردایەتی بکات وبەرەو لوتکەی شارستانیەتو پێشکەوتن دەستی بگرێت، ئەوا ئەو گەلە هەرگیزاو هەرگیز رێ بەدوژمنانوبەناحەزان نادات .

تێبینی : گۆڤاری بەیان سالی ١٩٨٩ ژمارە ١٥٤ لاپەرە ٣.

## هەڤاڵی تێکۆشەر سەدام حسین عێراقێکی دیموکراتیمان بۆ دادەمەزرێنیَ

نازدار کاوانی

دیموکراتیەت سەرچاوەی هێزە بۆ تاکە کەسێك و بۆ کۆمەڵیش بەگشتی، ئەمەش والەگەلو نەتەوە دەکات کەلە پێشکەوتنێکی بەردەوام دا بێتو هەمیشە بۆپێشەوە هەنگاو بنێت، چونکە هەر بەدیموکراتیەت دەتوانی چارەسەری هەموو گیرو گرفتەکانی بکات پێشەوای مەزن ( سەدام حسین ) دەڵیَ کاتیَ مەسەلەی دیموکراتیەت دەخەینە ڕو تەنها مەبەست لەبەکار هێنانی نیە .......... هتد

بەم شێوەیە سەرۆکی تێکۆشەر ( سەدام حسین ) دیموکراتیەتی پێشکەوتوی بۆ گەلو جەماوەر دارشتوە، لەپێناو خزمەت کردنی بەرژەوەندی گەل و هێنانەدی ژیانێکی سەربەستو لەسایەی ڕابەرایەتی گەلو بەوشێوەیەی گەل خۆی دەیەویَ لەگەڵ هیواو ئاواتو ئامانجەکانی دا یەك بگریَ .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ژمارە ١٥٤ ساڵی ١٩٨٩ لاپەڕە ٧ .

## شەهیدی نەمر عدنان خیراللە

## هەمیشە لەیادی هەموو عێراقیەکاندایە

**سالار محەمەد**

لەرۆژی یەکی شەوال دا لەکۆتای مانگی رەمەزانی پیرۆزدا عێراق یەکێك لەرۆڵە تێکۆشەرو پاڵەوانەکانی لەدەست چو، ئەو رۆڵەیەی کەهەمیشە وەك ئەستێرەیەکی پرشنگ دار و رێبازی خەباتی نیشتیمانی روناك دەکردەوە .

بەم شێوەیە رۆڵەی ئازاو تێکۆشەر خوالێخۆشبو عدنان خیراللە خۆشەویستی سەرۆکی فەرماندە ( صدام حسین ) بوو براو هاورێی ژیانو خەباتی بێوچانی بوو، بەشەهید بونی ئەم هاورێ تێکۆشەرە خەمو پەژارە سەرتاپای عێراقی گرتەوە هەرلەسەروی ولآتەوە تاخواروی بۆ کۆچ کردنی یەکێك لە هەرە ئازاترین پیاوەکانی داستانی ( قادسیەی سەدام ) و ئەو شمشێرەی کە ئالآی ولآتی هەروەك دارخورماو لوتکەی چیاسەر کەشەکان بەرز کردبویەوە .........تاد

تێبینی : گۆڤاری بەیان ژمارە ١٥٥ ساڵی ١٩٨٩ لاپەرە ٣ .

## بۆگیانی پاکی خوالێخۆشبوو
## عدنان خیرالله وەزیری بەرگری

## ئەستێرەی تێکۆشان داناچۆڕێ

**سەعید باتاسی**

ئەی پاڵەوان
ئەی سەربازی ڕێی کۆڵنەدان
تۆنەمردویت
نەڕۆیشتویت
تۆلەناخی هەموماندا زیندویت
ناوو ناونیشانت
هەرماوەو هەردەمێنێ
وێنەی پاڵەوانیت لەبەر چاوە
نمونەی دڵسۆزیت
لەبەر چاوە
ئەی پاڵەوان .
ئەی سەربازی ڕێڕەوی کاروان
ئەی ئەستێرەی پرشنگداری
ڕووی ئاسمان ......... تادوای

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٩ ژمارە ١٥٥ لاپەرە ٤ .

# خۆماڵی کردنە نەوت و پەرەسەندنی پرۆژەکانی ئابوری نیشتیمان

ڕێباز ڕەشید ئەحمەد

ئەوەبو هانی خومەینی جادو گەریان داو بەگژ شۆڕشیاندا داو لەچواری ئەیلولی ساڵی ۱۹۸۰ دا دەستدرێژی کردەسەر گوندو شارەکانی سەر سنوری عێراق، عێراقیش وەڵامی دایەوە و لەوەڵامدانەوەدا سەرکەوت .

ئەمە وای لەو ڕژێمەکرد درێژە بەجەنگ بداتو ماوەی هەشت ساڵی ڕەبەق کەجەنگ بەردەوام بوو چەندان شاڵاوی هێنایە سەر عێراق بەمەبەستی داگیرکردنی خاکی عێراق، بەڵام ڕۆڵە نەبەزەکانی عێراق بەبازوی پۆڵاینو سنگی پتەوی سەربازەکانی سەرۆك ( سەدام حسین )و سەرکردەی لێهاتوانەی سەرۆکی تێکۆشەر فەرماندە ( سەدام حسین ) وایکرد عێراق لەساڵی ۱۹۸۸ سەرکەوتن بەدی بهێنێو ئەو ڕژێمە سەر بۆ بڕیاری ۵۹۸ ی ئەنجومەنی ئاسایش دابنەوێنێت ................... تادوای

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ۱۹۸۹ ژمارە ۱۵۵ لاپەرە ٦ .

## هەندێ هوی سەرکەوتن لەجەنگی قادسیەی سەدام دا

هۆگر سورچی

فەرماندەی مێژوی لێهاتومان ( سەدام حسین ) دەورێکی یەکجار گەورەی بینی لەبەرێوەبردنی جەنگو وەدیهێنانی سەر کەوتنی مەزنی عێراق، چ لەروی نەخشە دانان چ لەبواری سەرپەریشتی کردنی مەیدانیو راستەو خۆیانەی راپەراندنی نەخشەکانەوە بێت .

بەتایبەتی چونکە سوپا قولێ بەکار تێکردنی فەرماندەکەی و رەفتارە عەسکەریەکەیەوە دەکەوێت، هەڵبەتە فەرماندە ( سەدام حسین ) خاوەن شارەزایەکی فراوانو رۆشنبیریەکی زانستیو مەوزو عیانەی سەرلەبەرو ئیرادەیەکی پۆلاین و تەواو باوەر بەخۆ بونو بیرو رەفتاری زیندو لەژینگەو دەوروبەر هەڵچێ نراوە ...... هتد

ئەمانە چەند هۆیەك بوون لەهۆیەکانی سەرکەوتنی عێراق مەزنمان لەجەنگی ( قادسیەی سەدام ) دا .......... تادوای

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٩ ژمارە ١٥٨ لاپەرە ٨ .

## بەبۆنەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسا دانان و راپەراندنی لە کوردستان

**کەرەم عەلی محەمەد**

مەسەلەی هەڵبژاردن و دیموکراتیەت لە عێراقی ( سەدام حسین ) کارێکی سەر سوڕ هێنەر نیە و بەکارێکی ئاسای دەدرێتە قەڵەم، چونکە ئەمە هەڵوێستی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستەو سەر کردەی داناو لێهاتوو کاك ( سەدام حسین ) بەردەوام دوپاتی ئەم لایەنە دەکات و داوا دەکات هەمیشە گەلەکەمان هوشیارانە هەریەکێ لەلایەن خۆیەوە هەست بە لێپرسراویەتی بکات .

بەمەش کۆمەڵ بەگشتی بەهێز دەبێت ئەمەش لەراستی دا لەعێراقی خۆشەویستماندا جێگای چەسپاوی خۆی گرتو هەموو عێراقیەکان لە چوار دەوری رابەرو مامۆستاو سەرکردەی دڵسۆزیان کۆبونەوەو بوون بە هێزێکی پۆلاین بۆ پاراستنی عێراقی مەزن، لەژێر سایەی پاڵەوانی گەل هەڤال ( سەدام حسین).

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٩ ژمارە ١٥٨دوا لاپەرە بەرگی گۆڤار .

## عێراق و ئێران و پێویستی ئاڵوگۆڕ کردنی دیلەکانی جەنگ .

زەینەب حسین

شەری عەرەبی و ئیسرائیل و مەسەلەی هیندو پاکستان کە ئاڵو گۆری دیلەکان تەواو کراو گەڕانەوە بۆ وڵات، پێش کشانەوە لەخاکەکانی داگیرکراو پیش مۆر کردنی لەسەر ڕێکەوتنامەی ئاشتی دا بۆیە کۆبونەوەی جنیف.

داوای لەهەر دوو لا کرد بوو کۆبونەوەیان لەژێر ئالای لێپرسراویەتی مرۆڤایەتیدا وەبەشداری بوان لەم کۆبونەوەیە خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی بەرامبەر هەموو هەنگاوەکانی مرۆڤایەتی وەك بەرەڵاکردنی دیلەکانی پەك کەوتوەکان لەلایەن هەردوو لاوە .

وەهەر لەم بارەیەوە کۆبونەوەی زاناکان دوپاتی پێشنیاری سەرۆکی فەرماندە (سەدام حسین) یان کرد کە بەرێزی ئامادوبونی عێراقی ئاشکرا کرد بوجێ بەجێ کردنی ئاڵو گۆر کردنی بەرفراوان ئەمەش هەنگاوێکی باشە لەکاری جێ بەجێ کردنی ئاشتیەکی تەواو چەسپاوی نیوان هەردو وڵات دا ......هتد.

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٩ ژمارە ١٦٠ لاپەرە ٩ .

## میهرەجانی میر بەرد

**عەلی حسێن**

ئـەوەبو شۆرشـی ١٧_ ٣٠ ی تـەمموزی نـەمر بەسـەرۆکایەتی قارەمـان (سـەدام حسین) بەرپابوو میر بـەردیش میربـەردی نـەمریش گەشـایەوەو ڕونـاکی لـەئاسمانی شاری بەسرەدا نیشتیمانەکەمانو ولآتانی عەرەبی رۆشن کردەوە .

بەسەری زمانو داهێنانو بیری سەربەستو جوان، ئەوەبو لەیـەکی نیـسانی سـالّی ١٩٧١ دا میهرەجانی یەکـەمی میربـەد کرایـەوە، بـەم جـۆرە بۆجـارێکی تـر میربـەد لەدایك بوو، بەبالآ جوانو بەرزو ڕەنگاو ڕەنگەکەیەوە هاتە دنیایەوە .

بەدەنگێکی ڕەسەنو ڕاسـتگۆوە بـەرگی قەشـەنگی خـۆی پۆشـی میربـەد دەنگـی زولاّلی نەتەوەیەو ویژدانی زیندوی هەموومانەو ووتـاری دلّـو مێـشکامانە، ئەمـەش لەسایەی قارەمانی دلّسۆزمان (سەدام حسین) خوابیپـارێزێ بـۆ جـاری دووەم هاتـە دنیاوە .

تێبینی : پێش هەموو شتێك ئەم ناوە واتە عەلی حسێن ئەو عەلی حسێنە نیە کە ئێستە بەرپرسی لقی دەی حزبی پارتیە، تەنها لێك چونێك لەناوەکانیاندا هاتوە، گۆڤاری بەیان سالّی ١٩٨٩ ژمارە ١٦٠ دوالاپەرە بەرگی گۆڤارەکە .

## ٨ ی شوبات ڕۆژێکی پرشنگدار

**کەریم محەمەد عەلی**

( سەدام حسین ) خوا بیپارێزێ بوکی شۆرشیان بەرپا کردو سەرکەوتنیان وەدی هێنا، بەلێ ئەمەش یەکەمین تاقی کردنەوەبو لەژیانی حزبماندا کە گەل بەرێوەی ببات، لەگەلێ ئەوەی ماوەی حوکومداریەتی شۆرشگێران نەبەردی کەمبوو، بەلام هەتا بلێیت دەسکەوتەکان زۆربون .

ئەم پالەوانانەی حزب لەخەباتو تێکۆشانیان دا بەردەوام بونو وازیان نەهێنا، چونکە ئامانجە پیرۆزەکە کەئامانج وداخوازی هەموو گەلەکەمانە لەبەر چاو بوو، هەتا رۆژی ١٧-٣٠ ی تەمموزی سالی ١٩٦٨ هات و شۆرشی گەورەی پارتی سەرکردە لەژێر ئالای قارەمانی گەل ( سەدام حسین )خوابیپارێزێ بەرپابوو گەلی عێراق لەسەرانسەری ولاتەکەماندا پێشوازیان لێکرد .

تێبینی : گۆڤاری بەیان سالی ١٩٩٠ ژمارە ١٦٣ لاپەرە ٥ .

## پیرۆز بێت جەژنی لەدایك بونی سەرۆكمان

محەمەد عبدلاّ رەحمان هەورامی

سەركردەی پاڵەوان‌و دلێری گەلەكەمان كاك ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ توانی بـۆ مـاوەی ئـەم سـاڵانە واتـە هـەر لەیەكـەم رۆژی بـەرپابونی شۆرشـی ١٧-٣٠ تەممورزەوە گەلەكەمان لەبارێكەوە بۆ بارێكی تر بگوازێتەوە .

قارەمان ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ سەر لەهەرشارێك یان دێك دەدات خـەڵكی بـە لاو منـداڵ‌و گـەورەو بـچوكەوە بـەگۆرانی‌و هەڵپـەركێ و خۆشەویـستی یـەوە دەچنە پیری خۆشحاڵی‌و كامەرانی خۆیان دەر دەبرن.

ئـیتر چـۆن گەلەكـەمان خۆیـان‌و مـاڵ و منـداڵیان نەكـەن قوربـانی رابـەری خۆشەویست‌و دڵسۆزیان، بەم بۆنەیەوە پیرۆزبای جەژنی لەدایك بوونی ئەستێرەی گەشی عێراق كاك ( سەدام حـسین ) خوابیپـارێزێ و تەمـەنی درێـژ بكـات دەكـەین، پیرۆزبای لەسەرۆكی خۆشەویستمان دەكـەین‌و دەلـێین كـاك ( سـەدام ) هەتاهـەتا بۆمان بمێنی .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٩٠ ژمارە ١٦٤ لاپەرە ٦.

## قارەمان سەدام حسین و

## جەژنی نەورۆز

**نەریمان حسین کەریم**

قارەمان ( سەدام حسین ) خوا بیپارێزێ رۆژی نەورۆزی کرد بە جەژنێکی رەسمی دەوڵەتو گەلی عێراق بەکوردو عەرەبو کەمایەتییەکانیەوە، لەسەرانسەری عێراق دا لەم رۆژە پیرۆزەدا ئاهەنگ گێران بەشداری دەکەن .

بەڵێ دەزانین سەرکردەی گەلەکەمان کاك ( سەدام حسین ) چەندکارێکی پیرۆزی کردوەو تاج رادەیەك بیری لەم مەسەلەیە کردوەتەوە، ئەمسالّ لەعێراقی خۆشەویستماندا لە ژێر سایەی پاڵەوانی گەل کاك ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ ئێمەش بەبۆنەی سەرکەوتنمان بەسەر دوژمنانی چەپەڵ واتە مەلاکانی تاران هێناو ئێرانیەکان لە( قادسیەی سەدام ) دا بەزەبری چەك تۆچیان دادا .

بەڵی لەرۆژی جەژنی پیرۆزی نەورۆزدا خۆشەویستی خۆمان بۆ کاك ( سەدام حسین ) دەردەبرینو تەمەن درێژی بۆ دەخوازین .

تێبینی : گۆڤاری بەیان سالّی ١٩٩٠ ژمارە ١٦٤ لاپەرە ٧ .

## فاو شاری فیدا کاریه

### سەبیح عبد لمجید

ئـەم خۆشـیو سەربەسـتیو شـەکاوەیەی مـن لەچیەوە هـاتوە، ئەمـە لەئـەجامی نەبەزیو قارەمانیەتی ئێوەوە بوە، ئێوەی رۆڵەی ئەم خاکە پیرۆزو پاك و بێگەردە، ئێوەی نەوەی قارەمان ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ .
بـەڵێ فـاو لـەدڵ و دەرونو هـەناوی هـەموو عێراقیەکاندایـە، ئێمـەش ئەوپـەری خۆشەویستی بۆ رابەرو پاڵەوانی گەلەکـەمان کـاك ( سـەدام حـسین ) خوابیپـارێزێ دەردەبرین، چونکە هەموو سەرکەوتنو بەخشش و دەسکەوتەکانمان لەسایەی دایە .
کاك ( سەدام حسین ) پاڵەوانی گشت سەرکەوتنە، لەپاشە رۆژیشدا لەسایەی کـاك ( سەدام حسین ) دا هەمیشە سەرکەوتن وەدی دەهێنین .
ئەم جیهانە لـەتۆوە فێـری خۆشەویـستیو خـەباتو رزگـاریو قوربـانی دان دەبـن کاتێ دەیانەوێت باسی رزگاری شارێك بکەن .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٩٠ ژمارە ١٦٤ دوالاپەرە بەرگە گۆڤار .

## بەبۆنەی یادی لەدایکبونی سەرکردەوە
## چەند شاعیرێك شیعر بۆسەرکردە دەلێن.

**نزار بەزاز . فاروق نەقشبەندی .هاشم جەباری .**
**عەباس مەجید . دیار محەمەد شەریف سندی**

دگەل هاتناسەرۆك سەدامدایە ..... رەوشی هەمی ملاڤەدا یە .
کاکە سەدامە.....و بابە سەدامە .
ئەی مێژوو سەرانسەری بون، ئەی عێراق خاكو پەردوت گشت ئالتونە .
ئەی سەدام سەرکردەی پڕ ئەمەك .
بەدەستم بێت هەموو دنیا دەکەم بەمۆم.
شاعیران بەگەزۆی ئەوین و
پیرۆزبایت بۆ بگێڕن .
هاتین بەمەشخەڵی سۆزو خەندەوە
هاتین لەدوندی قەندیلەوە
چۆپی دەکێشین
سرودی برایەتی ئەلێینەوە .

تێبینی : چەند هۆنراوەیەك بۆ یادی سەرۆکی عێراق سەدام حسین . گۆڤاری بەیان ساڵی ٢٠٠١ ژمارە ١٨٨ لاپەرە ٢

## لەپەنجەرەی رۆژگارەوە ......

نازم دڵبەند

کەلەدەرگای هەر ماڵە شەهیدێکی ئەم ولاتە دەدرێ لەجیاتی هۆنینەوەی فرمێسک بانگەوازی سەرفرازی هەڵدەدەن، هاواردەکەن بژی سەرۆك، ئەو سەرکردەیەی لەشەوانی مەینەتی دا خۆشەویستی بۆ جەنگاوەران دەبەخشێ.
تۆش ئەی سەرکردە ئەوەتای لەناو گلێنەی چاوی هەمووماندا . خۆشەویستیمان پێببەخشە . بەگوێمانا بچرپێنە، کەبجەنگین بۆ سەرفرازی گەل، بۆئەوەی دوژمن خەونی نەزۆکانەی نەیەتە دی . تۆش ئەی سەرکردە فێرت کردین، ولاتمان خۆشبوێت . ببین بەقەڵغانێ بۆگوللەی دوژمن .
لەو کاتەی بەرەنگاری دوژمن ئەبین، بقیژێنین بەدواوەبن، تەنها هەر تۆی سەرقافڵەچی و رابەری رێی تێکۆشانی نەبراوەمان ئەی پێشەوا ( سەدام حسین ) .

تێبینی : گۆڤاری بەیان . ساڵی ۱۹۸۲ ژمارە ۸۲ لاپەرە ۳ .

## بۆ سوپای قادسیەی سەدام

**حەسەن نامیق رەشید**

ئەوەی
لەشەوی لەدایك بونتا
مۆمت بۆنەسوتێنێ
شەستوو ، یەك چرا دانەگیرسێنێ
ووشەی ، چیرۆکوو ، شیعروو ، هۆنراوەی
کێکی تەمەنت بۆنەنەخشێنێ
دوای سەرکەوتنت
کە گەڕایتەوە
جا چۆن لەروی دێ
لەروتا دەستی رێز هەڵبڕێ
رۆلەی دلێری گەل بەرەنگاری
رەگەز پەرستیو دوژمن کاریو چاو برسێتی بۆ خاکی عێراق دەکات دوژمن لەناو ئەبات لەپێناوی قادسیەدا هەرگیز کۆڵ نادات .

تێبینی : گوڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٢ ژمارە ٨٢ لاپەرە ٨ .

## دەنگدانەوە

**ئەکرەم محمود سەمین**

کاکە شوکر ئێمە بەسایەی شۆرشی تەممونز بەسەرۆکایەتی (کاکە سەدام ) هەموو شتمان بۆهەیە ، نەك وەکوبراو ئامۆزاکانمان لەئێران‌و سوریا هەموو شتێك لێ حەرام کراوە، بگرە هەتا مۆسیقاشیان لێ حەرمام کراوە .
بەڵێ لەکوردستانی عێراق میهرەجان ساز ئەدرێ، مرۆڤی کورد بەمافە رەواکانی خۆی شادومانە، دۆستایەتی دێرینەی کوردو عەرەب رۆژ لەدوای رۆژ لەسایەی شۆرشی ١٧–٣٠ تەممونز لەژێر باڵی میهرەبانی (سەرەك سەدام )دا بتەو تر دەبێت .
سیماو خاسیەتی نەتەوایەتی کورد پتر رەگ دائەکوتێ‌و لەبەهاری برایەتی دا شێرە بەفرینەکان ئەتوێنەوە، ئەمە حاڵی ئێمەیەو ئەوەش حاڵی ئامۆزاو برازاکانمان لە هەندەرانمان .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٢ ژمارە ٨٢ دوا لاپەرە بەرگی گۆڤار .

## کوردستان لەچاوی سەرکردەوە

**وەلید حەمەسەعید جاف**

سەرەکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوا بیپارێزێ و ئاگاداری بێ، بایەخێکی زۆر بەهێنانەدی ئاواتەکانی گەلی کورد داوەو لەچارە سەرکردنی مەسەلەی کوردا چارەسەرکردنێك بەو جۆرەی لەگەل خۆشەویستی قوڵی سەرکردە بۆ گەلی عێراق هاوتایەو گەلی کوردیش زیاتر لەبەری ئەم خۆشەویستیە بەرکەوتوە .

دەر کردنی بەیانی١١ی ئادار و حوکمی زاتی بۆکورد بەتوانای گەلی کوردو عەرەبەوە هاتە دی، سەرەکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ کاتێ شانازی دەکا بە گەلی کوردستانەوە قاییل نابێت ناوی بە پاڵەوانی رزگاری نەتەوەبیەن، ئەوجا بەرێزی دەلێ هەست ناکەم رازیم کاتێ دەبینم کوردێکی گەلەکەمان هەست دەکەم وا دەزانێ کەدەلێین برا کوردەکان ئەوا ئەویش وەکو برایەکی ئەردەنی یان سوری دادەنێین، بەم شێوەیە سەرکردە دەروانێتە گەلی کوردمان .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ٢٠٠١ ژمارە ١٨٩ لاپەرە ٢.

## خەرجیان سوتا ١٥\\ ئاب

### عەلی ئیبراهیم دەروێش

سەرکەوتنێکی تازەی ئاسمانی
بری دەماری دڵی خومەینی
دورگەی خەرجیان کەوا سوتاوە
بۆمبای عێراق لەدڵیان داوە
فرۆکەکانمان شوێنیان ئەزانن
پاشاکانی قوم باباش بزانن
سوپای دڵسۆزمان بۆیان وەستاوە
وێنەی سەرۆکیان لەدڵیان داوە
عێراق ئەناسێ دۆستو دوژمنی
چڵکاو خۆرانی سوریاو قومی
تاکو سنور خۆی پاك نەکاتەوە
جەنگی رەوای گەل گشت نەباتەوە
رۆڵەی ئەم خاکە قەت چەك دانانێ
بەکوردو عەرەب ئەتان روخێنێ ...........تادوای

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٥ ژمارە ١١٢ لاپەرە ٧ .

## بۆ چاڤێته کەکێ سەدام

**هەوار بابەکر**

بۆ چاڤێته کەکێ سەدام
دلێت تێرن یێ ڤەدگێرن
چاڤێت زەلال پرهنێرن
ل هەمی گاڤا ئەو دلێرن
گولێت ژینێ دگەل ڤیانە
بۆ دیتنا بابێ واری
کاروانێ تە دێ ب رێ کەڤیت کەکێ
سەدام
دەنگێ مرادا ب سەر کەڤیت
ژیان بارانە بو دکەڤیت
چەند دریژبیت شەرێ ژینێ
چەند برێژیت چپکێت خینێ
کاروانێتە هەر دێ هەبیت
ناڤێ کاروانی نا کەڤیت

تێبینی : گۆڤاری بەیان سالّی ١٩٨٥ ژمارە ١١٤ لاپەرە ٢.

# چیرۆك نووسانی قادسیه

ئازاد مەحمود

ئەو رۆشنبیرانەی قەلەمەکانیان لەگەل لولەی تفەنگا بوەتە تیرو دەچەقێتە ناو چاوی دوژمنی گێلی هیچ نەزان، چیرۆك نووس و شاعیریو روناکبیرانی کورد، خۆشەویستی ئەم عێراقە مەزنەن، چونکە ئەم عێراقە شیرینە عێراقی کوردو عەرەبە، عێراقی برایەتیو دەسکەوتی مەزنە، عێراقی ئۆتۆنۆمیە، گەلی کوردمان لەعێراقدا سەربەرزە .

چونکە خاوەنی سەرکردەی بەتواناو بەهێزو پالەوانی هەڤالْ ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێیە.

دەبا هەر لەگەشەدابێت وشەی پیرۆزی کوردی، پیرۆزبێت ئەو سەرکەوتنەی کە چیرۆك نووسانی کورد لەپێش برکێی چیرۆکی کوردیدا لەسەر داستانی مەزنی (قادسیەی سەدام ) پیرۆز بەدەستیان هێنا .

تێبینی : گۆڤاری بەیان سالّی ١٩٨٦ ژمارە ١١٧ دوا لاپەرە بەرگی کتێب .

# سەركردەو خۆماڵی كردنی نەوت

**رەفعەت گلی**

هەندێ راستی هەن پێویستە بەردەوام باس بكرێنو بخرێنە یاد، لەوانەبەعسی عەرەبی سۆسیالیست لە رۆژی یەكەمی لەدایك بونی دا سەربەخۆی سیاسیوسەربەخۆی ئابوری پێكەوەپەوەیست كردوهەردوكیانی بەمەسەلەیەكی گرنگ دانا.
ئەو سەركەوتنە گەورەیەی گەلەكەمان بە سەرۆكایەتی تێكۆشەر( سەدام حسین ) وەدیی هێنا، سەرەتایەكی راستەقینەبوو بۆسەربەخۆی عێراق، هەروەها بەخاڵێكی سەرەتای دەژمێرا بەرەو شارستانیەتی نوێ لەمێژوی عێراقدا .
ئەو سەركەوتنە بوە هۆی گۆڕانی تەرازوی زۆربەی دەولەتان لەناوچەكەدا، پیرۆزبێت سەركەوتنمان لەیادی خۆماڵی كردنی نەوت، كە هەرگیزاو هەرگیز لەیاد ناچێت چونكە مێژو بە وشەی زێرین لەسەر لاپەرەكانی خۆی دەینوسێتەوە .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٦ ژمارە١١٩ لاپەرە ٢ .

## سەرکردەی هەموو گەل

**جەمال ئەحمەد**

لەگوندێکی ساکاری ئەم عێراقە، رۆڵەیەکی بەجەرگ لەدایك بوو، کەهەر لەسەرتای ژیانی لاویەتی جموجوڵو هەڵسوکەوتی رۆژانەو خەباتی لەهەموو بوارێکی کارکردندا دەری خست، ئەم رۆڵەیە دەبێتە موژدەیەکی گەورە بۆ عێراقی سەربڵند .

کەبەخۆشەویستی ئەم رۆڵە چاو نەترسەی لەباوەش گرت ئەگەر بێتو بەژیانو خەباتی سەرکردەی خۆشەویست ( سەدام حسین ) دا بچینەوە، پرە لەنمونەی قارەمانیەتی، و فیداکاری و چاونەترسی و هەستی شۆرشگێرانە بۆ گۆرینی عێراقو پێشکەوتنی ژیانو زامن کردنی ئاسودەییو خۆشبەختی بۆ گەلی عێراق .

لەسەردەمی هاورێو تێکۆشەر ( سەدام حسین ) عێراق کەوتەقۆناغێکی نوێوە، بەماوەیەکی کورت، ولآت سەردەمی راپەرینو تەقینەوەی شارستانی بەخۆیەوە بینی کەسەرنجی هەموو دنیای راکێشا، خۆشەویستی گەل بۆ سەرکردە ( سەدام حسین ) ناتوانرێ سنوری بۆدابنرێ .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٦ ژمارە ١٢٠ لاپەرە ٢.

## تیرمە ها دەسکەفتیا

سمکۆ عەلی

کا هاتنە ئامادەکرن بۆ شۆرشا ۱۷-۳۰ تیرمەهێ پشتێ کەفتنا ۸ شواتێ ل چریا دووێ سالا ۱۹٦۳ و هەژ وێ رۆژێ قوماندار یا پارتێ دەست ب هزرو بیرێت خو کرن بو رابونا شورشێ دژی حوکمێ عارفێ .
وان هەڤال ( سەدام حسین ) بو دەمێ شولی کومکرنا پێك هینانێ دانای لسەر ستوی خو لوەختێ هاتیە ژێك ڤەگرن و تەرا بەرابون ژ لایێ رژێما چریێ، هەڤال (سەدام حسین) بەرز بو وەکی قوماندارێکی قارەمان لدەمی پارتی گەلەك نەخوشی بەرهنگار بوین ئەو ژیك بدەورەکی بەرز رابو ژ قوماندداریا بزاڤا پارتی و رابو شورشی.
شولا هەنی کەتە لسەر ستوی ( سەدام حسین ) ئەڤە ژیك هاتە کردن ل ۳۰ تیرمەهێ و شۆرش قورتال بو ژ ڤی کری کرێی نەد دیدا .

تێبینی : گۆڤاری بەیان سالی ۱۹۸٦ ژمارە ۱۲۰ لاپەرە ٤ .

## ولاّتی من عیّراقه
## بهەلکەفتنا لەشکریّ مەیی قەهرەمان لەفەیلەقا ئیّکیّ وسیّو حەفتی

عبدالله تاهیر بیّسفکی

عیّراقا رەنگین
هەی نیشتیمانی من
خاکیّ پربها
ولاّتیّ شیرین
ئەی خوینا سور
دناف دلیدا
من دڤیت .... ته
بدەمه بەر سنگی خۆ
لەجەژنیّت سەرکەفتنیت
زیّریندا
من دڤیّت
نافیّ ته
بیّ جوان عیراق
گول‌وریّحانا ............ تادوای

تیّبینی : گۆڤاری بەیان سالّی ١٩٨٦ ژمارە ١٢٠ لاپەرە ١٠.

## باهەرشەکاوەبێت ئالآی شۆرشی

## ١٧-٣٠ ی تەمموزی پیرۆز

**عوسمان حەمد**

شۆرشـی ١٧-٣٠ ی تـەمموزی مـەزن بەسـەرۆکایەتی بـەرێز سـەرەکی فەرمانـدە (سەدام حـسین ) خوابیپـارێزیَ مـۆمی ١٨ مینـی دەکوژێنێتـەوە و یـادی بـیرەوەری تەمـەنی پـر لـەگۆرانکاریەو رونـاکی گـشت لایـەنێکی ولآتـە خۆشەویـستەکەمان دەکاتەوە .

شۆرشی ١٧-٣٠ی تەمموزی پیرۆز هەرلەسەرتای بەرپابونیـەوە مەسـەلەی کـوردو چارەسـەرکردنی رەچـاوکرد بـوو، ئـەوەبو دوای بـەرپابونی بەشـێوەیەکی ئاشـتی مەسەلەی کوردی چارەسەرکردو هێمنیو ئاشتی گەرایەوە ولآت، بەسەدەها پرۆژەی ئاوەدان کردەوە و گۆرینی روی کوردستانی عێراقی جیَ بەجیَ کـرد، بێگومـان لـەم گۆرانکاریانە بیَ هاوتای بەرێز سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) دەورێکی هەرە گرنگ و بالآی لەدابین کردنیدا هەبوو .

تێبینی : گۆڤاری بەیان سالّی ١٩٨٦ ژمارە ١٢٠ لاپەرە ٦ .

## شۆرشا تیرمەهیٚ و پیٚشکەفتنا رەوشنبیریا کوردی

وەسفی ردیٚنی

پشتی شەفەقا شۆرشی ١٧-٣٠ تیرمەها مەزن گەهشتیە هەمی دەڤەریت، ئەڤەیە شۆرشا ١٧-٣٠ی تیرمەهامەزن، شورشا دەسکەفتا شورشا پارتا بەعسا هەڤپشتك، شورشا بەیانا ١١ ئادارا پیرۆزاو ئوتونومی، ئەو شورشا ئەوا ئیکەتیا نیشتیمانی لعیراقی بهیٚز ئیٚخستیو کریە مۆکومترین چەپەرو سەنگەر بەرانبەر هیٚرشت ڤەمائیت دەجال خومەینی، ئو ژبیرا مە نەچیت کە مەزنترین دەسکەفتی ئەو دەمیٚ سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) گووتی: من دڤیت ئە فیربم ئەزمانی کوردی .

یان دەمی گووتی : کوردا لعیراقی دوو مافیت هەین مافەك وەك کوردو مافەك وەك عیراقی، ئەڤ گوتنیك سەرۆکی قوماندار جهیٚ شەهنازیی یە بو کوردیٚت عیراقا نوی، عیراقا شورشا ١٧-٣٠ تیرمەهیٚ هەزار سلڤ ل بیرهتنا شورشا ١٧- ٣٠ی تیرمەهیٚ مەزن .

تیٚبینی : گۆڤاری بەیان سالی ١٩٨٦ ژمارە ١٢٠ دوالاپەرە بەرگی گۆڤار .

## هەڵوێستێکی پاڵەوانانەی قادسیەی سەدام

**غازی ئەحمەد سعدالله**

لێرەدا لەسەر کیەوان هیدایەت داوای کرد قسەبکات ئەویش ریگای داو گووتی :
گەورەم کەئێمە لەنیوەی ریگادابوین بگەینە ئامانجەکەمان فەرمانداەی هێز شەهید بوو، کە ئێوە فەرماناتان دەداینێ بەردەوام داوای چۆنیەتی بارودۆخی شارتان دەکرد، دەبو لاسایی دەنگی فەرماندەی هێز بکەمەوە تا فەرمانەکان وەربگرم .
رابیگەیەنم چونکە بارو دۆخەکە ناسك بوو نەدەتوانرا هەواڵی شەهید بونی فەرماندەی هێزەکە بدرکێنم، بۆیە بەم چەشنە بەردەوام بوم، تا یارمەتیدەری فەرماندەی هێز گەیشتو روداوەکەم بۆگێرایەوە .
ئەمە هەموو ئەوەبوو کەدەبو باسی بکەم، ئینجا داوای لێبوردنی کرد گووتی : ئەرکەکە وای پێویست دەکرد .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٦ ژمارە ١٢٢ دوالاپەرە بەرگی گۆڤار .

# کونگرا ئێکی یا تورەڤان ونڤیسەڤانێت کورد

سگڤان عبدلحکیم

لناڤ خەلکیدا هەردیسا تورەڤانو نڤیسەڤانێت کورد بکارەك مەزن رادبن ژ بۆ تێگەهاندنا خەلکیو ئاڤا کرنا جفاکی لبن خیفەتا عیراقا خەملاندنی بقوماندار یا سەرۆکی مە ( سەدام حسین ) خودێ بپارێزیت .

ئـی کونگری نڤیسەری لە ٢٢\ ١٠ \ ١٩٨٦ هاتە دانان ، دەستەیە کونکری بۆ هەلبژاردن

د. نافع ئەیوب ئاکرەی

سەلاح شوان

عبدالکریم فەندی

محەمەدبەدری

سعید یەحیا خەتاب

سگڤان عبدلکریم

دلشاد مەریوانی

تێبینی : گۆڤاری بەیان سالی ١٩٨٦ ژمارە ١٢٤ دوالاپەرە بەرگی گۆڤار .

## شەهیدانی نیشتیمان

**سەلامی ڕەواندز**

لەراستیدا جەنگاوەرانی عێراق و لەبەر ئەوەی ( سەدام حسین ) سەرکردەو راپەریانە، هەمیشە سەربەرزن‌و سەرکەوتون‌و هەرگیز دوژمنان ناتوانن زەفەریان پێ بەرن یان فاکیان گلاو بکەن .

لەرۆژی شەهیدا سوارچاکانی قادسیەی دووەم بەڵێنی بۆ سەرکردەی قارەمان (سەدام حسین ) نوێ دەکەینەوە کەوا سنوری وڵات بکەینە گۆرستان بۆ دوژمنانی وڵاتمان .

جەنگاوەری عێراق زیاتر هێرش دەکاتو زیاتر سوپاو پاسدارانی مەلاکان رەوانەی دۆزەخ دەکەن، زیاتر سەرکەوتن وەدی دەهێنن زیاتر ئەوەیان چەسپان کەوا هێز نیە بتوانێت بزەی سەرلێوی عێراقیەکان بسرێتەوە .

بەڵێن دەدەین شەهیدانمان کەوا تۆڵە لێان بکەینەوەو بە هەزاران لێیان رەوانەی دۆزەخ بکەین، ئەمریش هەربۆ شەهیدانە .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٦ ژمارە ١٢٥ لاپەرە ١٠ .

## لەدایك بونی سەرکردە لەدایکبونی عیراقی نوێیە

شاسوار بەرزنجی

لەدایك بوونی سەرکردەی مەزن ( سەدام حسین ) لەو بارو دۆخەدا کەولآتەکەمان پێیدا ڕەت دەبوو، خۆی لەخۆیدا ئاسۆیەکی نویٚ بوو، کە عێراقیەکان بەکوردو عەرەبەوە بەم ڕۆژە پیرۆزە سەر بلّند بوون .

لێرە باسی ئەو دەورە خەبات گێرە گەورەیە ناکرێت کەسەرکردەی گەل ( سەدام حسین ) لەمێژودا نواندویەتی، کەبێگومان بریتیە لەخەباتێکی درێژخایەن لەپێناو ئەوەی عێراقی نویٚ بگاتە لوتکەی پێشکەوتنو گەشانەوە، دەوری خەباتگێری بێهاوتا ( سەدام حسین ) لەوەدایە کە عێراقی خستە قۆناغێکی ترەوەو لە ستەمکاری ڕزگاری کردو خستیە ئەو ڕۆژە پیرۆزەی کە ئەمرۆ بەوپەڕی سەربەرزی دەناسریٚو مرۆڤ شانازی بە عێراقیەتی خۆی دەکات .

( سەدام حسین ) سەرکردەیەکی کەم وێنەیە لەمێژوی نوێدا کەهەموو واتایەکی دیاری سەرکردایەتی پێوەدیارە .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٧ ژمارە ١٢٩ لاپەرە ٦ .

## بیرێکی ڕاگوزەر و دوو دیمەن

### ئەوزادشەفیق مەحمود

هەموومان بەپێی فەرمانی ئەفسەرەکەمان جەند هەنگاوێك پاشەو پـاش کـشاینەوە، دەی خۆتان بەزەویدا راکێشن، خۆمان بەزەویدا راکێشا، وتمان ئەی تۆ پێمـان نـالێی چی ؟ ووتی: لوغمێکم لە چێر دەسـتایە، نەجولێنـەوە، دووربتـان گرتـوە، لـەناکاودا لوغم تەقی، ئەفسەری هـەڤاڵمان گیـانی پـاکی سـپارت، لەگـەڵ دەنگـی تەقینـەوەی لوغمەکەدا دەسرێژێکمان لێکرا، ئەفسەری شەهیدمان دور
خستەوە .

ئیدی پاشان ............ هـەروا ژمارەیـەك چـەك‌و کەرەسـەی جـەنگ‌و داگیرکردنـی سـەنگەری بنکەکـەیان دەسـت کـەوت، کـەرۆژ بـوەوە، هـەڤاڵانمان سـەربازانی ( قادسیەی سـەدام ) گەیـشتنە یارمـەتی دانمـان، بۆگواسـتنەوەی لاشـەی ئەفـسەری شەهیدمان، لەگەل گواستنەوەی چەك‌و کەرەسـتەی دەسـت کـەوتومان چـەك کردنـی بەدیل گیراوەکان بۆبنکەی ناوچەی خۆمان .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٢ ژمارە ٧٩ لاپەڕە ٥ .

## چیرۆك لەبەردەم جەنگەوە

## بازێکی مەنگ

**ئازاد شەفیق**

شەوێك تیپێکی دوژمن، کەبریتی بو لەسەربازی هێزی تایبەتو پاسەوانەکانی خومەینی، لەناوچەی سەرپێڵ زەهاودا لەوەدا بوون کەهێرش بەرنەسەر بنکەی بازو هاورێکانی بەگەمارۆدانیان، بەڵام بازی دلێرمان بە دوو چاوی پرتیشك.
دوو گوێی رادارەوە دوژمنی وەدیکرد ؟ بازو هەڤالانی پێشی ئەوەی دوژمن نەخشەی خۆی بەکار بهێنیّ و بجولێتەوە گەمارۆی هێزی فارسی دوژمنی دا .
بەموشەکو دەست رێژی توندو تیژ بەبیّ ماوە دان بەو هێزە دوژمنە کە ناچاری کردن پاش زیانێکی گەورە و کوژراو بەجیّ هێلان لەگەڵ چەکو کەرەسەی جەنگ، دوژمن بەسەر شۆڕی بگەرێتەوە ؟ لەدورەوە دوو پەیکەر بەدیار کەوتن، دوو سەربازی ئێرانی بەجیّ ماو، دەستەسرێکی سپیان بەرز کردەوە، لەکوشتن رزگاریان بوو، باز روی کلاشینکۆفەکەی کردنیّ فەرمانیّ گەیشتە گوێی باز نەیانکوژیّ .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٢ ژمارە ٧٩ لاپەرە ٦ .

## نيشتيمانەكەم

**پرشنگ شەفيق**

دلنيابە، ئيمەين رۆلەى كۆلنەدەر، دژى فارسى دوژمن و نەژاد پەرستو هەموو دوژمنان دەجەنگين هەتا دەگەين بەمافى دادوەريمان لەخاكو ئاوماندا بەسەرۆكايەتى فەرماندەى دلير، سەرۆكى تيكۆشەرمان ( سەدام حسين ) .

فەرماندەى گشتى هيزە چەكدارەكان، پەيمانت دەدەينى كە هەموو رۆژيك سەركەوتنى نوێ تۆمار بكەين لەبەركانى جەنگدا، بەشايەتى داستانەكانمان لەبسيتينو خەفافيەو سەرپيلو زەهاو گيلانى رۆژئاواو سۆمارو بەرەكانى ترى .

دوژمنمان لەفارس و زايۆنىو رەگەز پەرستى، بەهاوكارى ئيمپرياليزمى ئەمريكى داويكى چەپەلو پيسيان بۆدانابوين، دەستى دوژمنايەتيان بۆسەر سنورەكان كيشا، شارەكانمانيان بۆردومان كرد، فارسى كينە بازو نەژاد پەرست، لەناو ئامانج دابوو كەبەئاسانى بەئاواتو ئامانجى خۆى بگات، بەلام نەيدەزانى بەچوەشيرانى عيراقى شۆرش، عيراقى بەعس بەئاسانى بۆيان نايەتە دەس، ............ تادواى

تيبينى : گۆڤارى بەيان سالى ۱۹۸۲ ژمارە ۷۹ لاپەرە ۸ .

## خومەینی و نیازی ئیمپریالیزم

ئیسماعیل گەیلانی

رۆڵەکانی عێراق سنگیان کردە قەڵغانی بەرگری کردن لەخاکی عێراق، هەموو عێراقیەکان بەگەنج و لاو پیرو ئافرەت، دەستیان بەرز کردەوە داوا ئەکەن بەشداری لەجەنگی ( قادسیەی سەدام ) دا بکەن .

هەروەك بەردەوامیش لەبەژداری کردنیان لەجەنگی رەوادا جەنگی شەرەفمەندی، دایکان و خوشکان شانازیان بە رۆڵەو براکانیان ئەکرد بەخوێنی پاکی خۆیان نیشتیمان ئەپارێزن ئائەمەیە مرۆڤی عێراقی نوێ، کەلەژێر سێبەری شۆرشی ١٧-٣٠ تەممووزی نەمردا کەپارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست پشتی پێبەستوە و باوەریشی هەرگیزاو هەرگیز بەم گەلە مەزنە لەق نابێت بانۆکەران و هەموو نیاز چەپەڵەکان لەداخانا یەخەی خۆیان هەڵدرن .

ئەو گەلەی کەباوەری بە سەرکردایەتی سیاییو مێژووی پارت و شۆرش هەیە باوەرپەکی پتەویشی هەیە بە سەرۆکی تێکۆشەر ( سەدام حسین ) .

تێبینی :گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٤ ژمارە ٩٩ لاپەرە ١٠ .

## سەرۆك سەدام حسین و دەوری سەرکردایەتی دەرکەوتووی لەبزوتنەوەی بێلایەنیدا

**کوردۆ محەمەد**

لەبەر ئەوە سیاسەتی بزوتنەوەی بێلایەن بریتی بوو لە دوژمنکاری کردنی ئیمپریالیزمو شوێن کەوتنو داگیر کردن، هەروەك لەوتارەکەی سەرۆکی تێکۆشەر ( سەدام حسین )دا هاتووە دوژمنکاری کردنی ئیمپریالیزم تەقەلایەکەبۆ وەدیهاتنی هەڵکەوتوانی نیشتیمانیو نەتەوەیی گەلانو بەربەرکانی کردنی شوێن کەوتنو وەدیهێنانی دروشمی سەربەستیو دوژمنکاری کردنی داگیرکردنە، جێ گرەوەی سرۆشتی و وەدیهێنانی ڕەوای بەو گەیشتنە پێشکەوتنێکی ئەو سەربەست هەلبژێریو سەربەست رەفتار بکا .

سەرۆك ( سەدام حسین ) لەوتارەکەیدا دەسنیشان کردنی ئەو دەمە تەقێیەی کەلەنێوان پەیوەندی سەربەستی مرۆڤولە نێوان ڕزگار بووندا هەیە لەژێر دەستەی دەرەو بێگانەیەك دەستی بەسەر هەموو توانایەکدا گرتوە .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٢ ژمارە ٨١ لاپەرە ٩ .

## سەبارەت بەنووسنی مێژووەوە

ڕۆزان مارف

سەرەك ( سەدام حسین ) ئاگاداری ئەوەش ئەكات كەئەبێ وریای ئەوەبن لەشیكردنەوەی مێژوودا لایەنی ڕاستی بگیرێ‌و پشت بەتیوری ڕوت نەبەسترێ بەو باوەرەی كە بۆ هەموو سەردەم هەموو شوێنێك دەست ئەدات .

چونكە ئەمە دەستمان پێ لە تایبەت كاریمان هەلئەگرێ‌و ئەكەوینە ناو ئومەمیەتێكی بەرەلاو لەشێوازە بێكەڵكیەكەیدا گیر دەخۆین، سەرۆكی تێكۆشەر ( سەدام حسین ) ئەوە دوپات ئەكاتەوە كە بەعسیەك ئەبێت شیكردنەوەی ئازایانەی ئەوتۆ بەدەستەوە بدات .

حزبەكەمان حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالیست دەربڕینێكی ڕاست‌و ڕەسەن‌و بەتوانا لەم ڕووەوە دەر ئەبرێ .

هەڵوێستیشمان بەرانبەر بەئاینەكانی ئاسمان ئەوەیە كەلەنێوان كوفرو ئایندا بێلایەن نین‌و لەگەل ئایندایین‌و مافی سەربەستیش بەمرۆڤ ئەدەین .

كەباوەری بەوە هەبێت چ ئاینێكی بوێ بەپێی ئەو رێبازەی كەباوەری پێیەتی مەسەلەی ئاینی خۆی هەلبژێرێ .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٢ ژمارە ٨١ لاپەرە ١٠ .

## هەموو خۆشەویستیەك بۆ سەدام حسین ی سەرکردە

**فەقێ حسێن**

ئەم هەموو خۆشەویستیە بۆ هەبێ بەرانبەر ( سەدام حسین )ی سەرکردە ؟ ئەم پرسیارە کەسێك دەیکات خەڵکی ئەم وڵاتە نەبێت، بەڵام ئەبینێ هەموو جەماوەر بەشانازیو خۆشەویستیەوە لەدەوری سەرکردەی پێشەوا ( سەدام حسین ) کۆ ئەبینەوە .

خۆشەویستی وشەیەکی گەورەیەو شەیداکان بەگەلێ جۆری شەیدایان بەکاری ئەهێنن، بەڵام شەیدای بوونی نیشتیمان بەگەورەترینی ئەوانە ئەمێنێتەوە، شەیدا بوونی سەرکردەی جەماوەر شان ئەدات لەشانی شەیدا بوونی نیشتیمان، ( سەدام حسین ) هەموو خۆشەویستی یەکو شەیدایەکی دەست ئەکەوێ لەهەموو لایەکەوە .

( سەدام حسین ) ئەم سەرچاوە نەتەوایە مرۆڤانە نوێ یيە کە ئەم خاکە دروستی کرد توانی لەماوەیەکی کەمدا نەخشەی دوا ڕۆژ بۆنەتەوەو نیشتیمان بکێشێ و توانی دەرمان لەسەر برین دا بنێ بۆ ئەوەی بەرزی بەعسی بردنەوەی نەتەوەی عەرەب دروست بکات .

تێبینی : گۆڤاری بەیان ساڵی ١٩٨٢ ژمارە ٨١ لاپەرە١٢.

## لەچیرۆکی جەنگەوە

## چەپکە نێرگزێك و مانگەشەو

**جەلال ئەسعەد چەرمەگا**

دەست خۆش دەست خۆش کاوە گیان دەست ڕاست وانەبێت، نەك باوکی باوکم نەخێر لەدووهەمیشدا، لەسێهەمیشدا، بەلام هەرچەندە هاوارم کرد لێی کەلەسەنگەرەکەوە نەچێتە دەرەوە بەلام بەقسەی نەکردم، بەراکردن بەرەو دەبابە شکاوەکە رایکرد، هەرلەو کاتەدا هێرشەکەی دوژمن شکاو دوژمن بەرەو دواوە گەرایەوە بەلام بەداخەوە .

هەزارجار بەداخەوە، دیارە لەدورەوە چاویان لەکاوە بوو، لەسەر یەکێك لەو زرێپۆشانە کە کاوە شکاندبووی گوللەیەکی ڕەشاش دەرچوو دای لەسەر سنگی پاکی کاوە ی دلێرو ئازا .

کاوە کەوت، داخی گرانم کاوە شەهید بوو، کاوە داستانێکی تۆمار کرد کە بەردەوام شایەنی باسەو جێگای سەر بەرزیە بۆ هەموو فەوجەکەمان هەلمگرت و نام بەسنگمەوە، تێر تێر ماچم کرد، هێنامەوە ناو سەنگەرەکەمان و بەدەستە سرەکەی گیرفانی نێرگزەکەم بەست و خستمەوە سەر سنگی .

تێبینی : گۆڤاری بەیان سالی ١٩٨٢ ژمارە ٨١ لاپەرە ١٨ .

## جەژنی سوپای سەرکەوتن

**یاسین تەها**

خۆ لاپەڕەی ئەم شەش ساڵەی جەنگی ( قادسیەی سەدام ) گەلێك ڕاستی بۆدنیا لەفیداکاری و نموونەی قارەمانیەتی سوپای دلێرمان ڕوون کردەوە، لەهەموو هێرشێکدا ئێران کردیە سەر ولأتە ئازیزەکەمان، بەشی هەر شکستو دۆڕان بوو .

ئەمەش لەئەنجامی لێهاتویی سەرکردەی گەل ( سەدام حسین )و دەستی مەردانەی سوپای دلێر کە زۆر مەردانە توانی بوونی خۆی بسەلمێنێ، لەهەمان کاتا ئەو ورە بەرزەی دەربری کە سوپا قارەمانەکەمان هەیەتی لە تۆمار کردنی هەموو مانایەکی سەرەکەوتن لەجەنگدا .

یەکێك لەخاسیەتە هەرە دیارەکانی سوپای عێراق، بریتیە لەوەی کە ئەم سوپایە سوپای باوەرە، واتە بەبیرو مێشكو هەموو ویژدان دەجەنگێت، ئەمە یەکێك بوو لەهۆیەکانی سەرکەوتن .

سەرکردەی خەباتگێڕیش ( سەدام حسین ) هەمیشە لەگەل جەنگاوەران ژیاوە، زۆر لەنزیکەوە لەتۆمار کردنی سەرکەوتنەکان بەشداری کردوە، بگرە هۆیەکی دیار بوە لەبەرز کردنەوەی ورەی جەنگاوەران .

تێبینی : ئەم یاسن تەهایە، یاسین تەهای هاوڕێم لەرۆژنامەی ئاوێنە نیە تکایە باخوێنەران ئەوە بزانن، چونکە ئەو هاوڕێیەم زۆر منداڵەو لەنەوەی نەوەدەکانە .

گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٨٢ ژمارە ٤ لاپەرە ٥٩.

## قائد شعبنا يطير صدور ابناء كردستان بوسام الشرفوالعزة

**عماد عثمان احمد البارزانى**

**مدير عام ديوان المجلس التشريعى**

اوضح السيد الرئيس لقد القائد ( صدام حسين ) فى كلمة التاريخية مع المقاتلين الشجاع جملة حقائق جوهرية عن الاوضاع التى يعيشاها ابناء شعبنا الكردى فى كردستان العراق وما تحققت لهم من مكاسب عظيمة من خلال ثورة من تمموز الخالدة .

وما يعيشة اشقائنا الاكراد فى الاقطار المجاورة فى ظل الانظمة الحاكمة فى هدة البلدان . نحن لا نريد التزكير بالكتسبات العظيمة التى تحققت لشعبنا الكردى فى كردستان لاننا نعيشها ونلمسها لمس اليد واصبحت ولضحة وضوح الشمس ولا نريد مقارنة وضعنا بوضع اخواننا فى الدورل المجاورة لانكم تعرفون .

تێبینی : گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٨٣ ژماره ٢ لاپەره ٥

## یادی پیرۆز

**عومەر عەلی شەریف**

ئەمرۆ لەژێر سایەی شۆڕشی ١٧–٣٠ گەلاوێژی پیرۆز جەژنی نەورۆز لەکوردستانی عێراق تام و نرخێکی تایبەتی هەیە، چونکە جەژنی برایەتی‌و یەکیەتی‌و ئۆتۆنۆمی هاتە پاڵ، ئێمە لەرۆژانێکی وەك ئەمڕۆدا کەیادی ئادارو نەورۆزو ئۆتۆنۆمی ئەکەینەوە، یادی کاروانێکی پێشکەوتن‌و پردەسکەوت دەکەینەوە .
لەناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان، ئەم ناوچەیە کەبایەخێکی ئێجگار بێ هاوتای پێ دراوە لەلایەن ئەندازیاری ئۆتۆنۆمی سەرۆکی خۆشەویست ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ .
یادت بەخێر ئادارو ئۆتۆنۆمی کوردستان، پتەو تربێت کاروانی ئۆتۆنۆمی و پێشکەوتن لەژێر ئاڵای سەرۆکی خۆشەویستمان، ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ .
یادت بەخێر ئەی جەژنی نەورۆزی خۆشەویست یادت بەخێر ئەی کاوەی ئاسنگەر، تێکدەری قەڵای زوڵمی ئەژدیهاك .

تێبینی : گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٨٧ ژمارە ١ لاپەرە ٥١ .

## سەربەرزی بۆ ئۆتۆنۆمی و ڕەوتی پێشکەوتن و پەرەپێدان .

**فائیق تاهیر ڕەشید**

لەم ڕۆژە پیرۆزانەدا کەپڕە لەسەرکەوتن، بەسەر خومەینیە زایۆنیزمەکانا، ئەو سەرکەوتنە گەورە گەورانەی کە سەربازانی عێراقی ئازاو دلێر وەدەستی دەهێنن نیشانەی ورەبەرزی و بڕوایەکی پۆلاینە بەسەر کەوتنی یەکجارەکی .
گەلی عێراقی تێکۆشەر لەسایەی دەسکەوتە بەکەڵك و چاکەکانی شۆرشی ١٧–٣٠ تەمموزو سەرکردە پاڵەوانەکەی بەرێز ( سەدام حسین ). خوابیپارێزێ .
بەبۆنەی جەژنەکانی ئازارو نەورۆزەوە گەرمترین پیرۆزبای لەسەرۆکی فەرماندەمان بەرێز ( سەدام حسین ) دەکەین . سەربەرزیو سەر فرازی بۆ گەلی کوردمان کەبەرو بومی تاقیمانەی ئۆتۆنۆمین .
لەسایەی ئاڵای شەکاوەی عێراقو بەسەرکردایەتی ڕۆڵە بەوەفاکەی گەل کاك ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ هەر لەسەر کەوتنەوە بەری ئاسۆش گەش و ڕوناکە .

تێبینی : گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٨٨ ژمارە ٥٨ لاپەرە ٦٥

## وتەو لێدوانەکانی سەرکردە قوتاپخانەی گەلن

خالید خۆشناو

( سەدام حسین ))سەرکردەو شۆڕەسواری لەخۆبردوی حیزبوگەلو هەمیشە هەستی شۆڕشگێرانەی بەوتەو ڕەفتاری بەجیێ دەر دەبڕیێو، هەربۆیە داوا لەگشت ئەندامانوکادیرانی حزب دەکات کەلەهەموو هەنگاوێکیاندا ئەوسیفەتە پەیڕەو بکەنو بەهۆیەوە خۆیان لەگێرەشێوێنیو خوانەخواستە لەڕێگای ڕاست لادان بپارێزنو هەمیشە بیرو باوەڕ وبەها بەنرخەکانی حزب بخەنە پێش چاو .

ئەوەتاسەرۆکی فرماندە زنجیرەیەك دانیشتنو چاوپێکەوتنی لەگەڵ کادیری بەرەی پێشەوادا سازکردوە، لەیەکێك لەو چاوپێکەوتنانەدا دەفەرمویێ ((پێویستە گەل ڕەزامەندی خۆی بەبیێ هاندانی کەس دەربڕیێوسەربەست بێت لەو هەڵبژاردنەی دابەجۆش بیت لەئاست دەوری سەرکردایەتی ئەم هاوڕێیە یان ئەویان ........لەهەر ئاستوشوێنێکدا ڕابەرایەتی گەلی کرد گەل لەلایەنی مرۆڤایەتیەوە لێی ڕازی بێتو لەو ڕەوشتو کردارانەی کەپەیوەندی بەبیرو باوەڕەوە هەیە ئازادە ....

جائەوەی لەپەیوەندی بەستن بە گەلەوە هەبێت ئەوا بێگومان سەرکەوتو دەبێت، وتەو لێدوانەکانی قوتاپخانە بەچێژوگەل، واتای شۆڕشو مەرجانی پاراستنی گەل فێری کادیرانی حزب دەکات ، کەئەمەش بنچینەی چەسپاوە بۆپاراستنی حزب .

........ هتد

تێبینی : ئەم وتارە لە ساڵی ( ١٩٩٩ ) وە لە ژمارە ( ١٣٧ ) ی گۆڤاری ڕەنگین بلاّو بوەتەوە، لە لاپەڕە ( ٢ ).

## ئالأی عێراق هەمیشە بەرزە

**ئەحمەد زەردەشت**

گەلی کوردمان ڕۆلێکی کاری گەری هەبوولەکێشەی بەرگری کردن لەخاكو نیشتیمانو هەڵسوڕانی جەنگە عادیلانەکەماندا، هەروەها ڕۆشنبیرانو نووسەرانو ئەدیبو هونەرمەندانی کورد، هەریەکەو لەئاستی خۆیەوە دەسپێشخەری و پێشبڕکێیان دەکرد و هەستی نیشتیمان پەروەری خۆیان بەئەدەبو هونەری ڕاستو نایاب دەردەبڕیو وەك شانەی هەنگ کاریان دەکردوو بەرهەمو داهێنانی شۆڕش گێڕانەیان بۆ هاندانی جەماوەرییەکی لەو ڕاستیە پتەو چەسپاوانەی داستانی ( قادسیەی سەدام ) ئەوەبو گشت ڕۆڵەکانی گەل بەکوردو عەرەبو کەمایەتیەکانی ترەوە لەدەوری سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسێن ) خوا بیپارێزێ کۆببنەوە .

جەنگی قادسیە بوبەبەردی بناغەی پتەو کردنی یەکیەتی گەلی عێراقمانو بنچینەی بەرگری گرتن لەجەنگی داستانی ( ام المعارك ) داو لەوەو پاشتر خۆڕاگرتنی لەڕادەبەدەری مەردانەی گەل لەئاست گەمارۆی ستەمکاری .

هەزار سڵاو بۆگیانی پاکی شەهیدانی نیشتیمان و پیرۆزبای لەخۆمانو سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزیٔو سەرکەوتن هەربۆ گەلەکەمان ......ماویەتی...

تێبینی : ئەم وتارە لەگۆڤاری ڕەنگین ساڵی ( ۱۹۹۹ ) ژمارە ( ۱۳۷ ) لاپەڕە (٤ ) بلأو بوەتەوە .

## سلاّو له سه‌ر كرده‌ی ڕۆژی سه‌ركه‌وتنی مه‌زن

**كامیل جه‌میل سوره مێری**

هه‌موو جیهان ئاگاداره عێراق پاش هه‌شت ساڵ جه‌نگه به‌ناهه‌ق به‌سه‌ریدا سه‌پێنراو چۆن به‌سه‌ر كه‌وتن لێی ده‌رچوو، ئه‌و سه‌ركه‌وتنه‌ی قادسیه‌بو به‌هۆی مه‌ترسی هێزه گه‌وره‌كانی سه‌ر زه‌مین له‌سه‌ر كرده‌و گه‌ل وسوپای عێراق، چاك ده‌یان زانی بناغه‌ی ئێران له سه‌رده‌می حه‌مه‌ڕه‌زاو داڕێژرابوكه‌به‌رانبه‌ر گه‌وره‌ترین ولاّتو زلترین هێزبوه‌ستێ، ئه‌یانزانی كه ڕاوبۆچونو نه‌خشه‌كانیان پوچه‌ڵ ده‌كرێته‌وه .

ئه‌وه‌تا ئه‌مڕۆش ئێران داری ئه‌و كرداره نابه‌جێو به‌ناهه‌ق چونه به‌گژ عێراقیه‌كاندابه‌گیانیه‌وه دیاره، وه‌ك گه‌له‌كه‌ش بۆیان ڕون بوه‌ته‌وه زیاتر ئه‌و ووتارو باس وئاینو خاكو داگیر كردنه هه‌موبۆ ڕۆژ بردنه‌سه‌ر بوبۆشه‌ڕه‌كه، كه هه‌ڵیان گیرساند ئه‌وه‌بوو هه‌موفرتوفێڵو درۆو باسی سه‌ركه‌وتنو گه‌یاندنی باوه‌ڕیان به‌جیهان وه‌ك خۆیان وتیان به‌رداخێك ژه‌هری مێژوو بوو سوپاو گه‌لی عێراق به ئازایه‌تی سه‌ركرده ده‌رخواردی دانو وه‌كوگورزێكی وی پیادان تاكو مێژوو ماوه ده‌بێ گه‌لی ئێران نه‌فره‌ت له خوێنو شه‌ڕو كوشتن بكه‌ن ........... هتد

تێبینی : ئه‌م وتاره له ساڵی ( ١٩٩٩ ) گوڤاری ڕه‌نگین ژماره ( ١٣٧ ) لاپه‌ڕه ( ٥ ) بلاّو بوه‌ته‌وه .

## سەر كردەمانی

**ئیبراهیم رەحیم بەرزنجی**

بژیت ،سەربەرز بیت ،
نیشتیمانەکەم ...
لانەی بەچکە شێر
هێزو گیانەکەم
لەچی دەناڵی ؟
باری قورسی گەمارۆیە !
یا ناڵە ناڵەو زەبری برینت !
دەسا بەبەس بێ
گیانمان فیداتە ..
لەپێشە هە نگاومان
سەرمان لەرێتە
ڕاسپاردەی باو باپیرانمانی
گەوهەری بینای
چاوەکانمانی
کاتێ دەڕوانیت لەتیشکی خۆرو
ئاسمانی شینت ، خاکی بەپێزو پڕ خێرت
نووسراوە بێگەرد،لەهەموولایەك
کاکە (( سەدامی )) سەرکردەمان

تێبینی : ئەمشیعرە لەگۆڤاری ڕەنگین ساڵی ( ۱۹۹۹ ) ژمارە ( ۱۳۷ ) لاپەڕە ( ٥ ) بلاّو بوەتەوە .

## چارەسەر کردنی مەسەلەی کورد

**سالار عو سمان زەنگەنە**

پێش بەرپابونی شۆڕشی ١٧– ٣٠ ی تەموزی مەزنی١٩٦٨ میلەتی کوردمان بە بارو دۆخێکی ناهەمواردا دەڕۆیشتو کۆنەپەرستانو ئیستعمار وزایۆنیزم سودیان لە شەڕی براکوژی چێژتبو . ئەوەبو دوای چەندین ساڵ لەشەڕی براکوژیو ئاژاوە، حیزبی بەعسی سۆشیالیست عەرەب لە ( ١١ ) ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ بەیان نامەی ئاداری دەرکردو بەسەر کردایەتی ڕابەری لێهاتو ئەندازیاری ئۆتۆنۆمی کوردستان کاك ( سەدام حسین ) ( خابیپارێزێ) بایەخێکی گەورەی دا بەناوچەی کوردستان و بەمیلەتی کوردمان وناوچەی ئۆتۆنۆمی .
بۆ پێشکەوتنو بوژانەوەو شادمانی میلەتی کوردمان و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر پێش دەکەوتو دەبوژایەوەو بەرەو پێشەوە دەچوو، کە ئێستا بارێکی ناهەموارتەمێکی ڕەش دایگرتوەتەوەو منەی سەرلەنوێ گەڕانەوەی دەسەلاتی شۆڕشە تاتیشکی ڕوناکی رووی تێبکاتەوە، هەزار سلاوی وەفاداری بۆ سەرۆکی تێکۆشەر کاك (سەدام حسین) خوابیپارێزێ ........ماویەتی ........

تێبینی: ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕەنگین ساڵی ١٩٩٩لەژمارە ( ١٢٧ ) لاپەڕە ( ٣٠ ) بلاو بوەتەوە .

## شۆڕشی تەموز ڕەوتی سەرکەوتنی بەردەوام

دکتۆر فوئاد حسین ئەحمەد

گەر خێرا بەوردی بەڕەوتی مەزنی شۆڕشی ١٧– ٣٠ تەموزی مەزن بچینەوە هەرلەیەکەم ڕۆژی هەڵگیرسانی لەساڵی ١٩٦٨ تا ئێستاکەئەمەش بەوتارێکی ئاوها کورتو دەمودەس هەقی تەواوی خۆی نادرێتێ، بەلام هیچ نەبێت دەتوانین هەندێ لایەنی پڕ ڕوناکی ڕەوتی شۆڕشە سەرکەوتوەکەمان بخەینە ڕوو کەخاوەنی گەلێ دەسکەوتی مەزنو بالآیە کە بۆ ڕۆڵەکانی گەلی عێراق لە سێبەری شۆڕشو بەڕێز سەرۆکی فەرماندەی تێکۆشەر ( سەدام حسین ) خوا پشتو پەنای بێت هاتوەتە دی .......

سەرفرازیو ئاوەدان کردنەوە و ئارامی ناوچەی کوردستانی عێراقی گرتەوەو گەلێ دەسکەوتی دی مەزن کەلەسێبەری شۆڕش هاتوەتە دی ئەوەی خاوەن ویژدان بێ ئەبێ دان بەوە بنێت کەم شۆڕش هەیە لەدنیا دەسکەوتی یەك لە دوا یەکی بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەی مسۆگەر کردوە وەکو شۆڕشی ١٧ –٣٠ – تەمموزو لەسێبەری سەرکردەی دانا( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ............ تادوای .........

تێبینی : ئەم وتارە لەگۆڤاری ڕەنگین بلاو کراوەتەوە لەساڵی ٢٠٠٢ لەژمارە ( ١٦٢ ) لاپەڕە ( ٦ )

## جەنگە پیرۆزەکەی خۆماڵی کردنی نەوت

ئسماعیل فازڵ جاف

هەموو ساڵێك لەیەکی حوزەیرانەوە ئەو یادە پیرۆزەمان دێتەوە یاد، بەڵێ بڕیاری خۆماڵی کردنی نەوت کە بەهەوڵ کۆششو بیری ڕۆشنبیری بلیمەتانەی سەرکردە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ هاتە دی سەرکەوتنێکی تەواوەتی سیاسی بو بۆ عێراق لەتەك سەرفرازی ئابوری کەسەرکەوتنە سیاسیەکە بێ سەرکەوتنو سەربەستی ئابوری چ ناگەیەنێ و عێراق توانی چۆك بەکۆمپانیا قۆرغ کارە ئیمپریالیزمو زایۆنیزمەکان داداو سەر لەئاستی خواستو ویستی عێراقدا دانەوێنێ ..........هتد

ئەوەش بوو هەر ئەو جەنگەش بوو دوو جەنگی گەورەی تری لەدواوە بووکە یەکەمیان جەنگی ( قادسیەی سەدام )ی شکۆمەند بو، ئەویتریش داستانی ( ام المعارك ) پیرۆزە .... کەهەردوو کیان لنگە فرتێی دوا هەناسەی ئیمپریالیزم بوو بەمەبەستی تۆڵە کردنەوەی ناڕەوا، بەڵام خواست و ویستی عێراق و عێراقیەکان بەهێزو تواناتر بوو .

پشت بەیەزدان هەرسەرکەوتو دەبین و لەگشت بارێکدا چۆك بۆ داگیر کەرو چاوچنۆکو بێگانە دادەنێین .............هتد

تێبینی : ئەم وتارە لە گۆڤاری ڕەنگینی ساڵی ( ٢٠٠٢ ) و ژمارە ( ١٦٠ ) لاپەڕە ٤ بلاو کراوەتەوە .

# ڕۆڵەی کوردو ڕۆژی کشانی مەزن

مەی محەمەد

حەمە وەك هەموو بەیانیەك لەخەو هەستاو دەموچاو ددانەکانی پاك شتو جلە جوانەکانی لەبەر کردو لەپەنجەرەکەوە سەیری دیمەنی چیاو هەتاوەکەی کرد، کەزۆر جوانو دڵڕفێن بوو، خەڵك هەموویان دەم بەپێکەنینو ڕوو خۆش بەو ناوەدا وەك ئاهەنگ هاتوو چۆیان ئەکرد، حەمەیش وێنەی تابلۆیەکی جوانی کێشاو بەدایكو باوکی ووت ئەوە من ئامادەم تا پێکەوە بە بڕۆین بۆمەڵبەندی ڕادان بۆسەر لەنوێ پەسەند کردنەوەی سەرکردە ،

باوکی بەزەردەخەنەوە سەیری حەمەی کرد ووتی : حەمە گیان ناشێ تۆ بەشداری کەیت لەم ڕا دەربڕینەدا حەمەش بەپەستیەکەوە ووتی : بۆ بابەگیان، لەوەڵامدا پێی ووت: ئەزانی بۆ چونکە تەمەنت لە ١٨ ساڵ بەرەو خوارترە بەڵام حەمەسوربو ووتی: من ئەم هەڵبژاردنە ببینم باوکی بەپێکەنینەوە ووتی قەینا تۆیش لەگەڵما وەرە تاسەیر بکەینو هاوبەشی خۆشی هەموومان بێت حەمە دڵی خۆش بوو تابلۆکەی هەڵگرت لەگەڵ باوكو دایکی دا ڕۆیشت و چوونەڕیزی ئەو خەڵکەوە کەهەموویان بەیەك دڵ و بەیەك دەنگ دەیانگوت بەڵێ بەڵێ بۆ ( کاکە سەدام ) . خوابیپارێزێو پشتیوانی بێت .

تێبینی : گۆڤاری ڕەنگین . ساڵی ٢٠٠٢ ژمارە ١٦٤ لاپەڕە ٦ .

## سەدام حسین بەهاری هەمیشەی عێراق

ڕێزان

کاروانی ڕازاوەی بەهارو ڕۆژ بەڕۆژ لەعێراقی سەر بەرزو خۆشەویست دا هەنگاو دەنێ بەرەو شادی و جەژنو بەختیاری تاکە گەیشتینە ( ٢١ ) ی مانگ، جەژنی نەورۆز لەئاسۆی ولآتدا سەری دەردێنێو هەموو سالێك سروشتی جوانی کوردستان خۆی لەئاوێنەی دلۆدەروونی ڕۆلەکانی دا دەنوێنێ .

ئیتر ڕۆلەکانی عێراق بەکوردو عەرەبەوە دەستی یەکتری دەگرنو شان بەشان شای شانازی دەگێڕنو بەدەنگی زولآلٚ بانگی سەربەستی ئەدەن، هاوار دەکەن بەخێربێت نەورۆز، بەخێربێت بەهار لەخاکی بەهاردا ، لەنیشتیمانی ( سەدام حسین )دا کەخۆی بەهاری هەمیشەی هەموو عێراقیەکانە ، کەوا ئێمە گشتمان گیانی خۆمان دەخەینە بەر دەستی لەپێناو سەربەرزی ئەو نیشتیمانەی کەسەرۆکی بەڕێز گەیاندیە لوتکە، سانەی نیشتیمان بەهرەی ڕەنگین ئەی خاکی ( سەدام حسین )، خوابکا هەموو ڕۆژانت بەهارو جەژن بێت، جەژن لەتۆو لەڕۆلەکانی گەل پیرۆزبێت .

تێبینی : ئەم نووسینە بەناوی خوازراوەوە بلآو کراوەتەوە ، دەشێ نووسەرەکانی ئەو سەردەمە بزانن کێ یە، لەگۆڤاری ڕەنگین ، سالی ١٩٨٩ .ژمارە ١٦ . لاپەڕە ٥ .

## له سەدا سەد عێراقیە

موختار فایەق

ئه سەرکەفتنا بناڤو دەنگ یاکو عێراقیێ بدەست ئێخستی وساروخا ( الحسین )
دروست کرد بەدەستا کورێت عێراقی و سەدا سەد عێراقیە، بەڕاستی دیاریا
زەلامێت پیشەسازی یا عەسکەری بۆ سەرۆکێ قوماندار ( سەدام حسین ) ( خودێ
بهێلێت ) جوانترین دیاریاو نیشانەیا تێگەهشتنو ئاقلێ مەندیا کوڕێ عێراقیێ نه .
ڤێجا بلا بزانیت کو هەر ساروخەکا الحسین بکەڤتیە سەر قوم تهران دێ تولێ
ڤەکرنا بیت بۆوان شەهیدێن سلێمانێیو حلبچەو بەسراو نەخۆشخانا دهۆکێو
قوتابخانا بلات الشهدا و ئەڤەیە بەرسڤا مەو هەکە ئەو تێناگەهن ئان خۆ
تێناگەهینن بلا باش بزانن کومە بەرسیڤێت مکوم ترو دژوارتر ێیت هەین .

تێبینی : ئەم وتارە لەگۆڤاری ڕەنگین بلاو بوەتەوە سالی ١٩٨٨ لاپەڕە ٧ ژمارەی
تایبەت بەنەوروز .

## سیٚ بروسکەی پیرۆز بای بۆ سەدام حسین

یەکەم : مامەند قەشقە : بمناسبةاحتفال قطرنا باعیاد ازار ءنوروز ، ارفـع للـرئیس القائد صدام حسین احر التهانی والتریکات ونحدد العهد والـولاء لـسیادتة فـی الحفـاظ علی روح النصر فی معرکة قادسیة صدام مجید .
دوەم : عمر حسن رسول : فی هدة الایام الخوالد التی یحتفل فیها قطرنـا المناضـل باعیاد ازار ء نوروز نتقدم بازکی ایـات التهـانی والتبریکـات الی قائـد الـسیر المناضـل صدام حسین حفظةاللة مجددین العهد والولاء لسیادتة لنکون امناء للدفاع عن عراقنـا الشامخ
سێیەم حسن حسین اللةداد : بمناسبة احتفالات شعبان العظیم باعیاد ازار ء نوروز ارفع ازکـی التهـانی والتبریکـات الی القائـد المنتـصر صـدام حـسین حفظةاللـة وتبقـی الجماهیر الطلابیة جنود اوفیاء خلف رایتة دفاعا عن عراقنا العظیم .

تێبینی : ئەم سێ پەیمان تازە کردنەوەیە بۆ صدام لە گۆڤاری ڕەنگینی ۱۹۸۸ ژمارەی تایبەت لاپەڕە ۹ بلأوبونەتەوە

## هێزی گەل و سەرکردەی قارەمان سەدام حسین ..

**عادل حسن ئەحمەد**

بۆماوەیەکی زۆر کورت و بۆئەوەی سەرکردەی گەل پاڵەوان ( سەدام حسین ) بۆگەلانی سەرزەمین دووپاتی بکاتەوە کەعێراقیەکان هێزوو توانایەکی بێ پایانیان هەیەو جڵەوی جەنگیان بەدەستەوەیە سێ هێرشی گەورەی کردە سەر دوژمنی داخ لەدڵ کە مەلایەکی پوچ و گەوج فەرمان ڕەوایان دەکات،

یەکەمین هێرش لەفاوبو داستانێکی مێژوییمان بەکات و وەختێکی کەمدا تۆمارکرد .

دوژمن لەژێر پێی پاڵەوانەکانی قادسیەی دووەم تلانەوەو بە هەزارانیان ڕەوانەی دۆزەخ کران فاومان گەڕاندەوە، بەلام چ جۆرە گەڕاندنەوەیەك مەگەر هەر دوژمن خۆی بزانێ سەربازەکانی ( سەدام حسین ) چۆن گورزی کوشندە دەوەشێنن، ئافەرین بۆ سەرکردەی قارەمان ( سەدام حسین ) و سەربازە دلێرەکانی .

تێبینی :ئەم وتارە لەساڵی ١٩٨٨ لە ژمارە ٨ ی گۆڤاری ڕەنگین لاپەرە ٢ بلاو بوەتەوە .

## بروسکەی پیرۆز بای

### شێخ عەلی شێخ ئەمین بەرزنجی

بەبۆنـەی یادەکـانی نـەورۆزو ئـادارەوە، وەك سـەربازێکە بـەوەفاو ئـازای نـاو بەرەکانی جەنگ پەیمانی خۆم دوربارە دەکەمەوە بۆ سەرۆك و سەرکردەم ( سـەدام حسین ) گەورە خوابیپارێزێ .

تێبینی :ڕەنگین ژمارە ٨ لاپەڕە ٥ .

## بروسکەی پیرۆزبای

ئەنوەر میرزا

بەبۆنـەی جـەژنی خۆشـی ۱۷_ ۳۰ ی تـەموزی پـیرۆزەوە بـەڵێنی خـۆم دوپـات دەکەمەوە بۆ سەرۆکی فەرماندەم ( سەدام حسین ) خوابپیـارێزێ کـە سـەربازێکی بەوەفای ڕێبازەکەی بم .

تێبینی : ڕەنگین ژمارە ۸ لاپەڕە ۸ ساڵی ۱۹۸۸

## بروسکەی پیرۆزبای

### حەمید زیرۆ هەرکی

بەبۆنـەی جەژنـەکانی نـەورۆزو ئـادارو ١٧ی ٣٠ی تـەموزەوە پیرۆزبـای لـەخۆم‌و سەرۆکی فەرماندەم کاکە ( سـەدام حـسین ) خوابیپـارێزێ دەکـەم‌و بـەڵێنی وەفـاو ئەمەکداری بۆ خۆیو ڕێبازەکـەی دوبارەکدەکەمـەوە هیـوادارم خواسـەلامەتی کـات‌و سەرکەوتوبێت بۆمان .

تێبینی : ڕەنگین ژمارە ٨ لاپەڕە ٨ ساڵی ١٩٨٨

## بروسکەی پیرۆز بای

عسمەت دینۆ

بەبۆنـــەی یـــادی ١٧ی ٣٠ی تـــەموزەوە . ئێمـــە وەك ســـەربازێکی بـــەوەفادڵی ئاخوندەکانی تـارانی عنـسوری دەوەسـتینەوەو وەبـەناوی خـۆمو فەوجەکەمـەوە بەردەوام دەبم لەدیفاع کردن لەسەرۆکی فەرماندەم ( سەدام حـسێن ) خوابیپـارێزێ بەرەو سەرکەوتنی عێراقی مەزن.

تێبینی : ڕەنگین ژمارە ٨ ساڵی ١٩٨٨ لاپەڕە ٥٧

## بروسکەی پیرۆز بای

**مەسعود کەبیر سورچی**

بـــەناوی خـــۆمو فەوجەکەمانـــەوە ئامـــادەین بـــۆ دیفـــاع کردنـــی نیـــشتیمانو ســـەرکردەمان ( ســـەدام حـــسین ) خوابیپـــارێزێ ،وە بەبۆنـــەی شۆرشـــی ١٧_٣٠ تەموزەوە پیرۆز بای خۆمان ئاراستەدەکەین و بەردەوام دەبین لەبەرگری کردن .

تێبینی : ڕەنگین ساڵی ١٩٨٨ ژمارە ٨ لاپەڕە ٥٧

## بروسکەی پیرۆز بای

**فازڵ مستەفا بەرواری**

بەبۆنەی جەژنی تـەموزی ئـازاوە، وەك سـەربازێکی بـەوەفا بـەڵێنی خـۆم دوپـات دەکەمەوە بۆ نیشتیمانو سەرۆکی فەرماندەم (سەدام حسێن ) خوا بیپارێزێ.

تێبینی : ڕەنگین ژمارە ٨ ساڵی ١٩٨٨ لاپەڕە ٥٧

## بروسکەی پیرۆزبای

**تاهیر حسین محەمەد جەباری**

بەبۆنەی جـەژنی تـەموزی نوێـوە، چـاوەڕوانین لەبـەرەکانی شـەڕدا بـۆ بـەرەنگار بونەوە بەخۆمانو فەوجەکەمانەوە، بۆ سەرکەوتنی سـەرۆکی گـەورەمان ( سـەدام حسین ) خوابیپارێزێ ، بۆ دیفاع کردن لەکوردی شەرەفمەند لـەژێر ئـالآی سـەرۆکی فەرماندەمان .

تێبینی : ڕەنگین ژمارە ٩ ساڵی ١٩٨٨ لاپەڕە ٥

## خۆر دەرکەوت

**سورکێو**

**شەو بوو، هەر شەوبوو ڕوناکی پڕبو لەتاریکی لەپی ڕەشی دێوەکان بەر ڕۆژیان گرت چاو چاوی نەدەبینی جەماوەر ماتو سەرسام بوو، بەلاّم ئەوەندەی پێنەچو کورەی خۆر لەپی دەستیانی سوتاند فریشتەی ڕوناکی خۆی ئاشکراکرد ئینجا شەوە زەنگ لەترسیدا سپی هەلگەڕا تینی خۆر دەریای خوێنی وشك كرد ،**

**بەتیشکەکەی چاوی شەمشەمە کوێرە و کوندەپەپوی کوێر کرد، کەلاوەکان ئاوەدان کرانەوە، سێدارەکان پێچرانەوە بولبولی خۆش ئاواز خوێندی شمشالی بەهەشت ڕوی زەوی سڕیەوە، کۆترە سپیەکان دیسانەوە بەئاسمانی شین دا دایانەوە لە شەقەی بالّ، پەریەکانو ساواکان کەوتنەوە خەندەو گڕوگالّ ( ئافەرین خۆر ، ئافەرین سەدام ،)**

**تێبینی : ئەم ناوە خوازراوە دلّنیام نووسەرەکانی ئەو سەردەمە دەیناسن، ڕەنگین سالّی ١٩٨٨ ژمارە ٤ لاپەڕە ٤ .**

## سەدام حسین و سەرکەوتنی خۆماڵی کردنی نەوت

**قەیس حسین حەمید**

جارێك لەپێش هەموو شتێکەوە دەبێت ئەوەبزانین کەخۆماڵی کردنی نەوت بەجەنگێکی گەورە دەژمێرێت ............ تاد

ئالێرەوە هەر لەم ڕوانگەیەوە، سەرکردەی سیاسیمان و پاڵەوانی گەلەکەمان هەڤاڵی تێکۆشەر ( سەدام حسین ) سەیری مەسەلەکەی کردو هەرلەیەکەمین ڕۆژی بەرپابونی شۆڕشی ١٧_٣٠ ی تەمموزەوە نەخشەو پلانی بۆ مەسەلەکە دانا، ئەم کارە وانەبێت کارێکی ئاسان بێت بەڵکو هەروەکو وتمان بەجەنگێکی گەورەی میلەت دەژمێرێت .

بەلأم سەرۆکی داناو هوشیارمان کاك ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت بەحیکمەتو سەبوری و دانایەوە، لەگەڵ هیمەتی گەلی پاڵەوانی عێراقدا توانی سەرکەوتنێکی گەورە و نایاب بەسەر ئەم کۆمپانیا مۆنۆپۆلانەدا بهێنیێو ئالأی عێراق بەرزو شەکاوە بێتو باکی لەدوژمنان نەبێت .

تێبینی : ڕەنگین ساڵی ١٩٨٨ ژمارە ٤ لاپەڕە ٨ ،

٢٠٠٤/٣/٦

## عابد سەرکەڤتنەکا دی یا عیراقی یە

**بریندار مزوری**

رۆژبەرۆژیێ عێراقا پێنگاڤێت بەرفرە دهاڤێتن بۆ ئاڤاکرنا عیراقا مەزن ،ئەهەرۆژ دگەهنە کورێت ولاتی . دوهی مزگینی یا موشەکا حسین پاشی موشەکا عەباس موشەکا ژ ێکبر فاو ( ١ ) ئێك – شاشی بالەفرا ئاگاهداری یا زویکا عدنان (١ )
ئەڤکاریێ سەرکڤتنا زانیاریا مەزن دەڤ دەستەکە کازانائو ئەندازیارو هونەر زانێت عیراقی بجە هات ئەوان ل بن قوماندار ( سەدام حسین ) چاودێریا فریق دکتۆر عامر حمودی السعید کاردکر . یێ کو ئەڤ کاریێ دانایا پێش چاڤێت خۆبو بجهێنا ویێ ل دەمەکێ وەسا عێراقی یا جاراکادی دیار کر کوئەون خودانێت علمو زانینێ .

تێبینی : ڕەنگین سالی ١٩٨٩ ژمارە ٢٤_ ٢٥ _ لاپەڕە ٢ .

## ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دەسکەوتێکی مەزنە

**شەفیق مەحمود جاف**

ئۆتۆنـۆمی واتــە حــوکمی خــۆ بــەڕێوەبردن، لــە ١٤ی تــەموزی ســاڵی ١٩٥٨ لەڕوخاندنی قەڵای زۆرداری قاسمیو عارفی لە شۆڕشە مەزنەکەماندا بەسەرۆکایەتی بەعسی عــەرەبی سۆشیالیــست بەڕابــەری ســەرۆکی فەرمانــدەی دلێــر و ڕابــەری سەرکەوتنمان سەرۆك ( سەدام حسین ) ئێمەی کردە خاوەنی ئۆتۆنۆمی .

ئەمــەش بەهــەداری بەخــشینی شۆڕشــەو لــەژیانێکی بەختــەوەری و کامــەرانیو سەربەستیو سەربەخۆدا دەژێیت، لەژێر سێبەری ئاڵای شەکاوەی شۆڕشـەکەمان بەڕابــەریو ســەرۆکایەتی ڕۆڵــەی دلێــری عێــراق عێراقــی کــوردو عــەرەب ســەرۆکی فەرماندەی ئەندازیاری شۆڕشو چەسپێنەری ئۆتۆنۆمی کوردستان بەڕێز ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ .

تێبینی : ڕەنگین ساڵی ١٩٩٠ ژمارە ٢٩ لاپەڕە٢٣ .

## سەرۆکی فەرماندەو گەورە سەدام حسین . خوابیپارێزێ

فتاح جاف

بۆ گەورەو سەرکردەو هاورێم بەڵێنت دەدەمێ سەربازێکی بەوەفاو شکۆمەندی تۆبم ئامادەم بەهەموو شێوەیە بەرگری لە عێراقی ئازیزم بکەم و وە پیرۆزبای خۆشم ئاراستەی تۆی گەورەو سەرکردەم دەکەم گەورەم ( سەدام حسێن ) خوا بتپارێزێ

تێبینی : ڕەنگین ساڵی ۱۹۸۹ ژمارە ۲۹ لاپەڕە ۲۵

## سەرۆکی فەرماندە سەدام حسین

**سەردارجاف**

بەڵێنی وەفای خۆم دوپات دەکەمەوە بۆ تۆی گەورەو بەرێزم ئامادەیم تێدایە لەپێناوی تۆو عێراقدا ببمەسەربازێکی ئازاو بەوەفا، کۆڵیش نادەم تاسەرکەوتن لەدوای سەرکەوتن تۆماردەکەین، هەربمێنی بۆمان .

تێبینی : ڕەنگین ساڵی ۱۹۸۹ ژمارە ۲۹ لاپەڕە ۲۵

## شۆڕشی ١٧ _ ٣٠ تەمموز

**گەلاوێژ حەسەن**

لەبارو دۆخێکە ئالۆزدا ڕێی کاروانی خۆی بڕی، ئەم کارانەش بوو کەهانی سەرکردەکانی ئەم شۆڕشەو هەڤالأنی بەسەرۆکایەتی سەرۆکی پالەوان سەرۆک ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ، هەڤالأن سەرکردەکانی ئەم شۆڕشە بەسەرۆکایەتی سەرۆک ( سەدام حسین ) و بەڕابەرایەتی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب دوای ئەوەی کە لێپسراوی ولأتی گرتە دەست .

ئیتر دەستیان کردە تێکۆشان بۆبەدی هێنانی خۆمالّی کردنی نەوت، ئەوەبو لەجەنگی ( قادسیەی سەدام )ی پیرۆز ئەم شۆڕشە توانی بەم دەسکەوتە مەزنانەی خۆی جێگربکا لەناو دلّی میلەتا، بەڕاستی ئەم شۆڕشە داستانێکی نوێی تۆمار کرد لەمێژووی جیهاندا.

سەرۆکمان خوا دەست بەتەمەنیەوە بگرێت، توانی هەموو گەلی عێراق لەژێر یەك ئالأو یەك بیرو باوەڕدا کۆبکاتەوە .

تێبینی : ڕەنگین سالّی ١٩٩٠ ژمارە ٢٩ لاپەڕە ٢٧ .

# شۆڕشی ١٧ _ ٣٠ گەلاوێژ لەناخی عێراقیەکانەوە هەڵقوڵاوە

دڵشاد ئەیوب سەعید

عێراقیەکان بەکوردو عەرەبو کەمایەتیەکانەوە بەوپەڕی خۆشی و کامەرانی یەوە یادی بیرەوەری ٢٢ ساڵەی بەرپابونی شۆڕشی ١٧ _ ٣٠ ی گەلاوێژی مەزن دەکەنەوە، بەسەرکردایەتی سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ کەلەبەر سێبەریدا بەخۆشیو بەختەوەری هێمنو ئاسودەی دەژین .

ئەم شۆڕشە لەڕۆژی ١٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨ بەسەرکردایەتی پارتی پێشڕەو پارتی بەعسی سۆشیالیست عەرەب بەرپابوو بەدەسکەوتێکی مەزن بۆگەلو نەتەوە دەمێك بوو چاوەڕێی شۆڕشێکی وایان دەکرد کەلەزوڵم وزۆرداری ڕزگاریان بکات، ڕوی ڕۆشنی عێراق دەربخات، ئەم شۆڕشە سەرتاپای ژیانی هەموو عێراقیەکانی گۆڕی .

سەدان دەسکەوتی بۆگەلو نەتەوە هێنا سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) دەورێکی سەرەکی هەبوو لەسەر کردایەتی کردنی ئەم شۆڕشە ......... هتد

تێبینی : ڕەنگین ساڵی ١٩٩٠ ژمارە ٢٩ لاپەڕە ٢٧ .

## شایی وشەی سەربەستو شایی شانازە

**ئیلهام عبدالکریم**

بەچاودێری سەرۆکی تێکۆشەر ( سەدام حسین )میهرەجانی گەورەی میربەد دەستی پێکرد، کەوا مامۆستا لەتیف نەسیف جاسم وەزیری رۆشنبیری لەبری سەرکردە وتارێکی خوێندەوە.

لەماوەی نێوان ٢٤ تا١ | ١٢\\ ١٠٨٧ شاری بەغدا چەند رۆژێکی نەمری بەسەر برد کەوشەی رەنگینی تێدا دەدرەوشایەوە دەنگی هەڵبەستو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی تێدا بەرز دەبویەوە، هەموو جیهان هاتبوو تا دڵخۆشی ئەو منداڵانە بدەنەوە لەقوتابخانەی بلات الشهدا دا کەبەهۆی ساروخی خومەینیەوە زەردەخەنەیان لەسەر لابرابوو دڵخۆشی بدەنەوە ............ هتد

تێبینی : رەنگین ریپۆرتاژێك لەسەر ستایش کردنی بەعسو سەرکردەکەی، ساڵی ١٩٨٧ ژمارە تایبەت لاپەرە ٩ .

## پاراسایکۆلۆجیاو قادسیەی سەدام

سەلاحەدین عەباس

جارێکیــان منــداڵێکی قوتــابی دێــت بــۆلای ســەرۆکمان ( ســەدام حــسین ) خوابیپارێزێ تەوقــەی لەگــەڵ دەکات، ســەرۆکمان بەقوتابیەکــە دەڵێــت تــۆم دیــوە ساڵێك لەمەوبەر لەم شـوێنە، قوتابیەکـە وەڵام دەداتــەوەو دەڵێــت : بــەڵێ گــەورەم فەرمودەت ڕاستە پار هاتوم بۆلات لەم شوێنە .
سەرۆکی بەڕێزمان خوابیپارێزێ لەو شوێنەی ئازایــەتی دەبەخـشی بەجـەنگاوەران هەندێ جار لای یــەکێکیان دەوەسـتاو بــە جــەنگاوەرەکانی دەوت تــۆ خــەڵقی فــلان پارێزگــای یــان تــۆ فلانــە عەشـیرەتی، هــەمووی ڕاســت دەردەچــوو ســەرۆکمان خوابیپارێزێ بە درێژی جـەنگی قادسـیەی دووەم دژی فارسـە مەجوسـەکان دەیـان جار بەوپەڕی بڕواوە دەیگوت پشت بە خوا ئێمەسەرکەوتوین ....... هتد

تێبینی : گۆڤاری ڕەنگین شاڵی ۱۱۹۸۹ ژمارە ۲٦ بلاپەڕە ٦ .

## بەبۆنەی لەدایکبونی سەرۆکی خۆشەویستەوە

سەبیح عبد لمجید

لە ٢٨ی نیسانی هەرسالێکدا، سەرانسەری گەلی عێراقی خۆشەویستمان، یادێکی شیرین‌و شکۆدار ئەکاتەوە، یادی لە دایکبونی سەرۆکی بەرێز هەڤاڵ ( سەدام حسین ) هەر لەم ڕۆژەوە لەساڵی ١٩٣٧ و لەڕۆژی دووشەممەدا، سەرۆکی تێکۆشەر لەگەڕەکی حارە و لەشاری تکریتا چاوی بۆ ژیان هەڵێناوە، مەبەستی ئاهەنگ گێڕانیش بەم ڕۆژە پیرۆزە لەلای ئێمەی عێراقی، گرنگی تایبەتی هەیە .
چونکە لەئەنجامدا ئەم ڕۆژە بوبە ئومێدی هەموانو ( سەدام حسین ) یش بو بەڕەمزی هەموو خودێکی عێراق‌و سەرکردایەتی بەرزی عێراق‌و دڵنیایی عێراق‌و کاروانی بێ کۆتایی‌و دەسکەوتی مەزنی عێراق .

تێبینی : گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ساڵی ١٩٨٣ ژمارە ٩٧ لاپەڕە ١٨ .

## یاریزانە بچوکەکان دەریان نەبرد
## یاریزانە گەورەکان هاتنە گۆڕێ

**دکتۆر سگڤان حوسێن بامەڕنی**

ئەوەبو بازۆفتێکیان بەسیخوری نارده ولاّتەکەمان بۆئەوەی دەست درێـژی بکەنـە سەر ئاسایشمان دوای ئەوەی کە عێراقیش مافی ڕەوای خۆی بـەکار بـردو بـازوفتی هەواڵەی دۆزەخ کرا، یاری زانە گەورەکان کردیانـە شـین‌و شـیپەرۆ وای لـەدۆو وای لەدۆشاو، بەئومێدی ئەوەی ڕژێمی زایۆنی دەست لەعێراق بوەشێنێ پاکانـەش بـۆ ئـەو دەسـت وەشـاندنەی بکـەن، بـەلاّم سـەرکردەی بەجـەرگو نەبـەردی عێـراق ( سەدام حسین ) لەو خەون‌و خەیالاّتە ئاگاداری کردنەوە کە عێراق پاروێکی دڕکاویـە لەگەرویان گیر دەبێ و دەیان فەوتێنێ .

تاکو ئێستاش باوکی ناجی‌و شێرە بەفرینـەکانی بنتـاگون چـاویان لەڕێیـەو بـۆنی نەوتی عێراق‌و خاکە ڕەنگینەکەی گێژو وێژی کردوون، بەڵکە ئەمە خوایکرد جارێکی دی شـوێن پێـی خۆیـان تێدابکەنـەوەو وەکـو جـاری جـاران بکەونـە تـالاّنی کردنـی خێروبێری ولاّتەکەمان‌و چەوسـاندنەوەی گەلەکـەمان، بـەلاّم خـەیاڵیان خـاوە وەك بڵێـی نـەزانن سـەرکردەی نەبـەز ( سـەدام حـسین ) پێـشەنگی پێـشکەوتنی ئـەم نیشتیمانیە.

تێبینی : گۆڤاری تەندروستی‌و کۆمەڵ ساڵی ١٩٩٠ ژمارەی تایبەت بەرگی گۆڤار .

## لەسایەی سێبەری سەرکردەدا

**ئەحمەد عبدلقادر نەقشبەندی**

لەسایەوسێبەری چاودێری کردنی بەمروەتو هەمیشەی دامەزرێنەری شکۆی عێراقی نوێو ئەندازیاری دەسکەوتە داهێنەرەکانی و پاڵەوانی سەرکەوتنە مەزنەکان، سەرۆکی فەرماندە بەڕێز ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێو ئاگاداری بێت بۆ کاروانی حوکمی زاتیو ناوچەی کوردستان و ڕۆڵە شکۆدارەکانی وە لەو جەنگی ئەو ئامەنگەی کە گەلی نەبەزی عێراق دەیگێڕن .

بەبۆنەی داستانە پڕ قارەمانێتیە بێ هاوتاکانی هێزە چەکدارە ئازاکانمان بەدرێژای بەرەکانمان شەری دژی تاقمەچەپەڵەکەی خومەینی، بەو پەری هەستی شانازیو سەربڵندیەوە پێشوازی یادی هەژدە ساڵانەی بڵاوکردنەوەی بەیانامەی یانزەی ئازاری مێژووی دەکەین .

ئەو بەیان نامەیەی کە بناغە ڕاستو پتەوەکانی یەکیەتی چەسپاند، ئەوا پەیمان تازە دەکەینەوە کەوا لەسەر هەمان ڕێڕەوی ساڵانی ڕابردوو بڕواتو عێراق بەرەو بەندەری بەختەوەری و دوارۆژێکی خۆش ببات بەڕابەرایەتی شۆڕەسواری مەزنو سەرکردەی هێژا سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ وا ئاگاداربێت .

تێبینی : گۆڤاری تەندروستی ساڵی ١٩٨٨ ژمارە ٦ لاپەرە ٤ بۆ ٦٢ .

## ئۆتۆنۆمی هیوای هەموو عێراقیەوە

سەعدون خەلیفە

ئـەزمونی ئۆتۆنـۆمی پیـادەکردنی داهێنـانێکی مەزنـەو نمونـەی راسـتگۆی حزبـی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستە ئەم ئەزمونەش دەکرێت بکرێتە دەلیلی کار بۆ هەموو ولاتێك کەچەند نەتەوەیەکی تیابێت، جاخزمەت گوزاری گشتی کەبۆ هەموو خـەڵکی ناوچەی ئۆتۆنۆمی ئەنجام دەدرێت لەعێراق دا .

جاناوچـەی ئۆتۆنـۆمی لـەعێراق تایبەتمەندیـەکی جـوگرافیو دەوروبـەری هەیـەو موشـکیلەی تەندروسـتی هەیـەو تایبەتـە بـەم ناوچـەیە هـەتا لـە مەشـق پێکـردنو ئامادەکای کادیری تەندروستی کارگەر .

ئالـەوێوە دەبـێ بەسـەر جـۆری ئـەم موشـکیلانە خەسـت بینـەوە کەخەڵکەکـە پێوەیـەوە دەنـاڵێنن، ئابـەم جـۆرە ئـەم ناوچـەیە دوارۆژێکـی پرشـنگداری دەبێـت ئەگەر پشت بەنەخشەی خۆجێیەتی بەسترا بۆ دەست نیشانکردنی چارەسـەرکردنی موشکیلەکان . ........................ تاداوی

تێبینی : گۆڤاری تەندروستی چاوپێکەوتن . ساڵی ١٩٨٨ ژمارە ٦ لاپەرە ٤ بۆ ٦٩

## بەبۆنەی رۆژی تەندروستی عێراقییەوە

عبدالرزاق مەرعی حسن

بەم جۆرە ئابوریەکی بەهێزمان بۆ هاتە کایەوە لەسایەی ویستو ئیرادەی سەرەکی فەرمانـدە، فەرمانـدەی شـۆرشو سـەرکردایەتی نیـشتیمانی دڵـسۆز، (سـەدام حـسین ) خوابیپـارێزێ .. سـەرکردەی شۆرشـی ١٧-٣٠ گەلاوێـژی نـەمر، هـەروەها پێـشکەوتنێکی زانـستیو پۆشـنبیری لەئاسـتێکی بـەرزدا هاتەکایـەوە کەدرێژەوە بە شارستانیەتی دۆڵی رافیدەینە لەهەموو مەیدانێکی زانستی دا .
جالەبەر ئەوەی کەپرۆسەی راپەرینی گەل پەیوەستە بە هێزو توانـای بـۆ دەربـاز بوون لەدواکەوتویو نەخۆشیەکانی هەروەها هێزو توانـای بـۆ گرتنـی خورەوشـتیو قیـەمو رەفتـاری راسـتو رەوان لـەرەفتاری رۆژانەیـدا ئـەوا سـەرۆکی فەرمانـدە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ دەمانخاتە نێوان رەوگەی شارسـتانیو پێشکەوتن لـە خیلالی رەفتاری شارستانی مرۆڤی عێراقی تازەداو ئەوەشیان لەئاستی سـەرکەوتنو ئاشتی دایە .
هـەروەها سـەرۆکی فەرمانـدە دەسـت نیـشانی رەگـەزەکانی شارسـتانی کـردوە بەپاکو خاوێنیو رێکیو رێکخستنو لیاقەو وردبینی لەبیرو تەگبیردا، لـەروی بنیـات نانی مرۆڤی عێراقی ئەوە بەرێزیان چەمکی تەعبیە دەست نیشان دەکات .......... تادوای .

تێبینی : گۆڤاری تەندروستی . ساڵی ١٩٨٩ ژمارە ١٢ لاپەرە ٥بۆ٧٢ .

## یەکیەتی نیشتیمانی لەپیلانی دوژمنان بەهێزترە

**دکتۆر نیهاد ئەبتەر زەنگەنە**

سەرکەوتنی عێراق بوو بەهۆی سەپاندنی ئاشتی بەسەر دوژمنانی عێراقدا کەدەیانویست ڕێبازی پێشکەوتن خوازی شۆرشگێرانەی گەلەکەمان بەرەو چەرخەکانی ناوەراست ببەنەوە، سایۆنیزم لەسەرکەوتنەکەمان بەگومانەو ئیمپیریالیەت و دارو دەستەکەی هەولی ئەوەیان دا ڕێرەوی ئاشتی تێك بدەن .

بەلام سەرۆکی فەماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ فەرمووی ئەو جۆرە جموجولانە سەرە دەرزیەکن دەچن بەتەنێکی زلدا، هەموو هەولێ و کۆششی سەهیۆنیەت و ئەمریکا ڕێبازی شۆرش‌و یەکیەتی نیشتیمانی پتەومانە چەواشە ناکەن لەعێراقی سەرکەوتوو ئاشتی خوازدا .

مەزنمان‌و رەمزی پایەبەرز سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ قەلای پۆلاین دژی هەموو گێرەشێوێن‌و ئەوانەی لەزەلکاودا مەلەدەکەن ئەوانەی دەیانەوێت ڕێبازی شۆرش لەهێلی خۆی لابدەن لەعێراقی خۆشەویستدا و یەکیەتی نیشتیمانی تێك بدەن .

ئەو یەکیەتیەی کەلەنێو هەردوو گەلی کوردو عەرەب لەعێراقی بەهێزدا بەسەرۆکایەتی ( سەدام حسین ) بۆ هەمیشە ........تادوای

تێبینی : گۆڤاری تەندروستی . سالی ١٩٨٨ ژمارە ١١ لاپەرە ٣ .

## ناوچەی کوردستانی ئۆتۆنۆمی

**محەمەد ئەمین محەمەد ئەحمەد**

ناوچەی کوردستانی ئۆتۆنۆمی ئێستاکە جولانەوەیەکی رۆشنبیری وابەخۆیەوە دەبینێت کەبەهیچ جۆرێك لەسەر شێوەی ئێستاکەیدا نەبوە، ئەو جولانەوەیەش دوا بەدوای ئەو پاڵپشتیەو پتەو کردنەی دامو دەزگا ئۆتۆنۆمیەوە دێت کەسەر کردایەتی شۆڕش گرنگیەکی زۆری پێداوە لەپێناوی گەشەپێدانی کاروبارەکانیان بەڕادەیەك کە بتوانێ جێ بەجێ کردنی یاسای ئۆتۆنۆمی زامن بکات .

ئەم گرنگی پێدانەش لەئەنجامی ئەوسەرلێدانە مەیدانیەی سەرۆکی فەرماندە (سەدام حسین ) خوابیپارێزێ بۆناوچەکەو چاوپێکەوتنی بەلێپسراوان و بەردەوام رێنمای کردنی دامو دەزگاکاندا وەدەر دەکەوێت .

وەلەئەنجامی ئەو زیاتر گرنگی پێدانە و ئەو یارمەتیو پاڵپشتیە بێ سنورانەی جولانەوەی رۆشنبیری لەناوچەکەدا کەئەمانەتی ئێمەیە . ئەمانەتی رۆشنبیرانو لاوانە ڕابەرایەتی دەکات گەشەی کردوە . ............... تادوای

تێبینی : گۆڤاری تەندروستی . ژمارە ٦ ساڵی ١٩٨٨ لاپەرە٥بۆ ٦٨ .

## بۆ سەرەکی فەرماندە

حەمەساڵەح عەزیز لادێیی

باوکی بەرێزو سەرداری وڵات
بەهۆی تۆوە گەل گەیشت بەئاوات
خاوەن ڕەو ڕەوەی مێژووی ئەم خاکە
هەمیشە خەریك کرداری چاکە
لەداوی دوژمن گەلت دەرهێنا
هێناتە ریزی گەلانی دنیا
داوی دوژمنت هەمووت کرد پوچەڵ
تۆ حوکمی گەلت هێنایە دەست گەل
تەمیمی نەوتت جێگای دیارە
دڵی دوژمنان بۆی بریندارە
هەندێ پیاو هاتن پیاوی ئیسرائیل
ئەیانویست خاك و وڵات بکەن دیل
تادوای.................

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٨٨٥ ژمارە ٧٧٢ لاپەرە ٧ .

## جەنگاوەرانی سلێمانی لەیادی ٢٢ ساڵەی بوکی شۆڕشا

ئەم ریپۆرتاژە لەلایەن لقی سلێمانی رۆژنامەی هاوکاریەوە کراوە، بەبۆنەی ٢٢ ساڵەی شۆرشی بەعسەوە، لەناو ئەم ریپۆرتاژەدا کەسانێکی زۆری باڵادەست لەناو کایە جیاجیاکانی حزبی بەعسدا قسەدەکەن لەپێناوی ستایش کردنی ئەو حزبە، لێرە بەنمونە چەن قسەیەك وەر دەگرین وەك ئەمانەتێکی رۆژنامەوانی .

عمرمحەمەد عویز : من کەجەنگاوەرێکم لە کۆمەڵەی بەرگری کردنی فرۆکە سڵاو رێزم بۆسەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) ئەنێرم کەپشت بەخوا سەرکەوتن هەربۆ ئێمەیە .

محەمەد عبدالقادر عەزیز: بەشداری کردنمان لە سوپاگەکانی سوپای میللی ئەرکێکی دلێرو جوامێرانەیە بەرانبەر بەنیشتیمانو بەرگری کردن لەخاکو وڵاتو پشت بەخواو سەرەکی تێکۆشەر باوکی گەورەمان ( سەدام حسین ) ی فەرماندە.

حسین مازی هادی : بەتواناو باوەڕەوە پەیمانی وەفاداری بۆ سەرەکی بێهاوتا ( سەدام حسین ) نوێ دەکەینەوە .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٨٥ ژمارە ٧٧٥ لاپەرە ٥ .

## دیاری بۆ لەشکری عێراق

## ولاّتی سەرکەفتنا

مسلم شکری عبد رەحمان

دنێ رۆژا ئاشێ هویر
رابموسن دەست ژدویر
کوبخازن ئاشتی
دگەل مافێن راستیی
بوتوم جیهان دیاربوو
ناحەزین بن دەستی
دێ شارینن گوفندی
ژبۆ خاترا ریوەندی
مە سۆز دایە ئەڤودوو
ئە ڤەمرینەوی فندی
ل گوندی ب هلورین
هەرو هەردی هەلپەرین
دێ بلندکین ئالاتە
وەك پلنگا دێ خورین
...................... تادوای

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری سالّی ١٩٨٥ ژمارە ٧٨٠ لاپەرە ١٤ .

## كارتی پیرۆزبایی

**مەهدی عبدلاَجاسم**

پیرۆزبێت سەرکەوتنی گەورەی گەلی عێراقمان، ئەو سەرکەوتنەی کەهەتا هەتایە لەرزە لەدڵی دوژمنی نەزانی داگیرکەر کەنەتوانێ جارێکی تر پێ بنێتە سنوری عێراقی خۆشەویستمان، سلاَو رێزم بۆ سەرۆکی فەرماندە تێکۆشەر هەڤاڵ ( سەدام حسین ) کەسەرکردەی بەتواناى عێراقی مەزنە، سلاَو لەبرا سەربازەکان کەبەگیان سنوری عێراقیان پاراست، مردنو سەرشۆری بۆ داگیرکەران، سلاَو لەشەهیدانی (قادسیەی سەدامی ) پیرۆز ئەوانەی لەهەمووان شکۆدار ترن .

## کارتی پیرۆزبای

**ئەنوەر محەمەد مەحمود**

**بۆسەرکەوتنەکانی سوپای دلێرمان و بیرەوەری هەفتـەی ( قادسـیەی سـەدام ). بەبۆنەی هەفتەی ( قادسیەی سەدامی ) پیرۆزەوە سلاوی مامۆسـتایانی سـلێمانی پێشکەش بە سەرەکی فەرمانده هـەفالی تێکۆشـەر ( سـەدام حـسین ) ........... تادوای**

**تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٨٥ ژمارە ٧٨٢ لاپەرە ٣ .**

## تۆ

**عەباس کامیل غەریب**

**ئەقڵو تەکبیرو سیاسەت زانی تۆ**
**دەریای تەفکیری فراوانی تۆ**
**سامانو کۆشکی فەزڵی هونەرت**
**کێوی بەهێزی نیشتیمانی تۆ**
**ئەی قارەمانی هەڵکەوتوی مێژوو**
**هەموو دڵبەندین بەئیحسانی تۆ**
**تائێستە زەمان رۆڵەی وای نەدی**
**وێنەی سوارچاکیو نەوجەوانی تۆ**
**ناوخۆی وڵاتو ئیسلامو عەرەب**
**دوعاگۆن بژی حوکمرانی تۆ**
**بۆمان بهێڵی هەر ( سەدام حسین )**
**خوایا بەلوتفی بێپایانی تۆ**

**تێبینی : ئەم شیعرە ژمارە ٧٨٢ ی رۆژنامەی هاوکاری لە ساڵی ١٩٨٥ لاپەرە ٧ بڵاوکراوەتەوە .**

## پێشەوا

**هیوا تەها**

کاتێ کەوا تۆ بویت بەپێشەوا
ڕۆژمان لێ هەڵهات شەومان لێ ئاوا
هەر لەو ڕۆژەوەی کەسەرەکمانی
گشتمان وادەژین بەکامەرانی
هەرتۆ خونچە بوی کەوا بوی بەگوڵ ،
گشت خۆشمان دەوێی بەئارەزوی دڵ
هەرخۆت سەرۆکی ئەی کاکە ( سەدام )
تۆمان خۆشدەوێیت . زیاتری لەبرام
ئێمە پێنج ساڵە کەدەکەین خەبات
بۆپاراستنی دێهاتو وڵات
سەرۆکمان بەخۆی بریاری داوە
شەر سودی نیە هەرخۆشی باوە
خومەی نەزانە سەری شێواوە
مێژەر بەسەری جادوگەرناوە .
........................ تادوای

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٨٥ ژمارە ٧٩٠ لاپەرە ٧ .

## چوارده ملیۆن مۆم

**ئازاد عبدلسەمەد**

بەڵێ ئەو نەخشە گەورەیەی لەمێشکی ( سەدام حسین ) دا بوو، زۆرلەوە گەورەتر بوو کەبەدوو چاوەکانی خۆمان بیبینین، لەچوار ساڵو نیوی جەنگ هێشتا عێراق لەبنیات نانو پەرەسەندنو پێشکەوتنی نەکەوتوە، دوای چوار ساڵ عێراق هەر لەسەرکەوتن دایە .

بەڵێ ئەو عێراقە سەرکەوتوە بەدانایی سەرکردەکانی بوو بەو ئەفسانە گەورەیە بەبلیمەتی مرۆڤێکی وەکو ( سەدام حسین ) بوبەرابەرو پێشرەو، لەپێناو بەرگری کردن لەخاکی عێراقو لەخاکی نەتەوە عەرەبەکان .

بۆیە ( سەدام حسین ) بەرەمزی خەباتو تێکۆشانی مێژووی عێراق دەژمێرێت، بۆیە کاتێ مۆمێکی تر لەژیانی ئەو مرۆڤە مەزنەدا هەڵدەگیرسێنین، چوارده ملیۆن مۆم لەدڵی گەورەو بچوکی ئەو عێراقەدا هەڵ دەگیرسێ بۆیە گەل بە ( سەدام حسین ) سەر بڵندە .

بۆیە پێی شادە، چونکە ( سەدام حسێن ) رزگار کەری عێراقو عێراقیەکانە، سەدام ئاواتە .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٨٥ ژمارە ٧٨٧ دوالاپەرە . گۆشەی هەرجارەو نووسینێك .

## لەیادی لەدایك بونی سەرکردە

**کاوە محەمەد ئەبوبەکر**

ئەی سەرکردە لەوەتەی هەیت هەموو ساتێك ژیانت بریتیە لە خەبات‌و کۆڵنەدان، لەڕەنج‌و هیلاکی لەپێناو پاراستنی ئەم عێراقە ئازیزە، لەدەست جادو گەران چونکە تۆ ڕەسەنیت .

تۆخۆری هەلاّتوی ئەم عێراقە بەرینەی لەچیاوە تا دەشتایی، خۆشیان دەویێی، خۆشەویستی تۆ وێردی سەرزاری هەموو منداڵانە، کەلە هەموو کاتێك باوکی ئەوانیت، هەمیشە لەباوەشیان دەگری،

عێراق بەتۆوە جوانە عێراق بەتۆوە گەشەو سەر بڵندە .

چونکە تۆبۆی تێکۆشایت‌و خێرت بەخشی ئەم ولاّتە شیرینەت کردە جوانی و مانای خۆشەویستیت فێرمان کرد، ئەی سەرکردەم لەهەر شوێنێك کەپەیدا ئەبیت خۆشیمان بۆدێنی، خۆشی دابەش دەکەیت بەسەرمانا .

کوردستانت کردە بەهەشت، بۆیە کەناوت دێ پیرو منداڵ ئافرەت‌و پیاو لەگەڵ ناوت دەهەژێن، تۆبویت سەربەرزیت فێرکردین بەشادی‌و خۆشی .

گەلەکەت شانازیت پێدەکا، لەئامێزت دەگرێت، دوعات بۆدەکا، لەکارگەو قوتابخانەو هەموو کونج‌و کەلەبەرێك بۆت هاوار دەکەن، بژی ( سەدام ) بژی ئەو رۆڵە بەجەرگەی ........... تادوای .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٨٥ ژمارە ٧٨٦ دوالاپەرە .

## بەتامترین یەکتر ناسین

**محەمەد ساڵەح عبدلکریم**

لەهەمووی بەتامتر لەلام ئەم یەکتر ناسینەیە لەگەڵ جەنگاوەراندا لە بەرەکانی جەنگدا دژی ئێرانی رەگەز پەرست، لەپشویەکمدا بۆ بەغدا بەرێکەوت جەنگاوەرێکم بینی کە لەقاعیدەکەی خۆم بوو، ئای کەدڵم کرایەوە بەپەرۆشەوە هەواڵی جەنگاوەرانم لێپرسی .

خوێنەران لەلاتان سەیر نەبێت ئەگەر بڵێم ئەم یەکتر ناسینە لە بەرەکانی جەنگدا پێك دێت، بەتامترو چێژی زیاتری دەمێنێتەوە لەو یەکتر ناسینەی کەلەزانکۆدا لەگەڵ شۆخێکدا پێك دەهات، هۆی سەلماندنی قسەکەم زۆرن .

یەکێك لەوانە ئامانجە ئامانجی هەموو جەنگاوەرانی ( قادسیەی سەدام ) سەرکەوتنەو بەرز کردنەوەو شەکاوەیی ئاڵای عێراقە لەژێر سێبەری هاورێی بێهاوتا ( سەدام حسین ) داو پیس نەبونی خاکە بەپیتو بەرەکەتەکەمان بەهاتنی دوژمنی هیچ نەزان، بەڵام ئامانجی یەکتری ناسین دوور لەبەری جەنگەوە یان مادیە یان بەرژەوەندیەکی کەسایەتی تایبەتی .

هۆی تر زۆرە بۆسەلماندنی قسەکەم ئێوە بیری لێبکەنەوە .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ساڵی ۱۹۸۵ ژمارە ۸۰٦ دوالاپەرە گۆشەی (هەرجارێك نووسینێك) .

## پێشکەشە بەشەهیدانی جەنگی ( قادسیەی سەدام ) ی تێکۆشەر

### ئاوڕی تۆ..... زۆر پرشنگە بیّ لەکەیە

سەلاح سەلیم سەیدۆك

ئازاریان چاند
سەختی رێیانم بەداسی دڵو بەژان بریەوە
شەهید بووم‌و تاهەتایە
نەمریم بۆخۆم دوریەوە
کیّ وەکو خۆر
لە زبانی مێژوو دەگا
تا وەڵامی شەهیدەکان بداتەوە
بەلای لایەی
گڕ مژینی تۆپ نەسڵەمێت‌و
کوێرە رێیان نەبیاتەوە
ئەزانم گەردی سەر سەختی
تاریکە شەوی فەرهەنگم
ئەخەیتە نێو گەروی چرا
جارێکی تر
تۆناسوتێی لەگێژەنا
مەشخەڵان‌و کڵپەی گڕا ............ تادوای

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٨٥ ژمارە ٨١٨ لاپەرە ٤

## شۆڕشی بیستی نەمر

**سەربەرست شارباژێڕی**

ئەوانەی ناحەز بەعێراق و گەلی عێراقن خەیاڵیان خاوە ئەگەر وابیر بکەنەوە گوایە لەڕێگای ئەو شەڕەوە بەهۆی خومەینی جادو گەرەوە بەسەریاندا سەپاندوە دەتوانن مل بەگەلی عێراق کەچ بکەن . عێراقی ئەمڕۆ لەلوتکەی سەربەرزیو سەرکەوتندایە، چۆن لەبەرەبەیانی مێژوەوە توانیویەتی دوژمنەکانی بکاتە پەندی زەمانە هەرنەوەکانی ونەمانەن ئەوە پێنج ساڵە ڕووبەڕووی دڕندەترین گەردەلولدا وەستاونو وەك شورای پۆلاین بەرگری لەمێژوو بوون و سەرکەوتنیان دەکەن .

عێراقی مەزن، عێراقی رۆڵەی سەرکەوتو ( سەدام حسین ) لەیادی ٦٥ ساڵەی ئەم شۆڕشەدا دەزانێ چۆن بەرگری لەمێژووی پڕ لەشانازی خۆی دەکاتو زیاترو بەرەو لوتکەی سەربەرزی زیاتر هەڵدەکشێو بەتوانای لەبن نەهاتوی ناحەزەکانی بەناخی شکاندنو سەرپێ شۆرکردندا دەباتە خوارێ .

یادی شۆڕشی بیستی نەمر گیانی ئازایەتیو مەردایەتی گەلی عێراق پتەو تر دەکاو یەکێتی نیشتیمانی کورد و عەرەب زیاتر دەچەسپێنێ و بەو پتەویو بەو یەکیتییە گومڕا کەرانەی ئێران دەکەن بەپەندو لوتیان لەزەلکاوی شکاندنی هەتا هەتای وەردەدەن.

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٨٥ ژمارە ٧٩٥ دوالاپەرە گۆشەی هەرجارەو نووسینێك .

## جەماوەری مەخموور پیرۆزبایی لەسەرۆك دەکەن بەبۆنەی جەژنی لەدایك بونیەوە

**غەفور مەخموری**

جەماوەری قەزای مەخموور بەبۆنەی جەژنی لەدایك بوونی سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین) خوابیپاریزێت، پیرۆزبایی لەسەرۆك دەکەن و هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازن بەم شێوەیەی خوارەوە .

هەڤاڵ خزر حسین عەلی ڕازگری سەرکردایەتی پارتی لەمەخموور، لەکاتێکا کەگەلەکەمان ئاهەنگ دەگێرێ بەبۆنەی جەژنی لەدایك بوونی سەرۆکی خەباتگێر ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێ .بەڵێنو وەفاداری خۆمان دووبارە دەکەینەوە کەسەربازێکی بەوەفابین بۆبەرگری کردن لەخاکی پیرۆزی عێراقو نەتەوەی عەرەب و داواکارین لەیەزدان تەمەن درێژبێت بۆهوشیار کردنەوەی نەتەوەو ڕێگای رزگار کردنی سەرکەوتنو ئاشتی پیرۆزبێت جەژنی لەدایك بونت پێشرەوی کاروانمان لەکۆتایدا هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی شەهیدانی ( قادسیەی صدام حسین ) هەموو ئەوانەی لەپیناوی عیراقدا گیانیان بەخشیوەو بەخوێن مێژووی عێراقیان تۆمار کردوە .

هاوڕێ عادل ئەحمەد حسین ڕازگری نووسینگەی قوتابیو لاوانی پارتی مەخموور لەمانگی نیسانی ئاسمانی عێراق هەڵهات ئەویش لە دایك بوونی هەڤاڵی تێکۆشەر ( سەدام حسین ) بوو ........... تادوای .

تێبینی : ئەم ریپۆرتاژە لە شاری مەخموور ئەنجام دراوە لە رۆژنامەی هاوکاری بلاوکراوەتەوە .

## عێراقی یەك پارچە

**سەلاح شوان**

کەپەڵە هەورێکی سپی لەباکوری زاخۆوە بەدەم شنەبای پایزی فێنکی کوردستانەوە هەڵئەکاو تەزوی خۆشەویستی بۆگەرمیانو بۆڕۆخی دەریا دەبا، هیچ قارونێك لەئێستا بەدواوە بۆی نیە داوای پەساپۆرتی پەڕینەوەی لێبکاتو نەهێڵێت فێنکی چیا سەرکەشو سەرفرازەکانی کوردستان گەرماکەی هاوین لە لەشی عێراقیەکانی باشور بڕەوێنێتەوە .

چونکە ئەمڕۆکە پارچەکانی ئازیزی خاکی عێراق کەلەجەرگەی عێراقیەکان بچڕێنرابوو بەدەستی دانایانەی ( سەدام حسین ) تیمارکرایەوە، جێ برینەکەی بۆهەتا هەتایە سارێژ بوو، هەرچی میکرۆبێکی ژەهر ڕێژ هەبوو کەلەو بەشەی دابوو تەفرو تونا کراو ژەهرەکانیان بوەوە ژەهری خۆکوژی، هائەمڕۆ ها سبەینێ لەناویان دەبات، چونکە بۆهەرکوێك بڕۆن هەرپێوەیانەوەیە .

دەمێك بوو دوژمنی کەم فرسەت لەڕۆژانێکی تاریکی ئەم وڵاتەدا نەشتەرگەرییەکی ناجوامێرانەی لەگەڵ ئەم خاکەپیرۆزەی عێراقدا کردو بەشێکی ناسکی لەشی دابڕی.

دەمێکیش بوو ئەم بەشە دابڕاوە دژی جەستە گشتیەکە بەکار دەهێنراو دەمێکیش بوو هەردوو بەشی لێك دابڕاو تاسەی سەرلەنوێ گیرسانەوە تا لەسەر دەستی حەکیمانەی ( سەدام حسین )ئەم ئاواتە شیرینەبەدی هاتو بۆ هەتا هەتایە عێراقی ( سەدام ) مەزن بووەوە بەیەك نیشتیمانی یەك پارچەو هیچ هێزێك نییە لە دنیادا دایبڕێت .

تێبینی : رۆژنامەی ئاسۆ ژمارە ٥٤ لاپەری ٣ بەرواری ١٩٩٠ .

## عێراقی سەربڵند

**برهان هەژار**

لەگەڵ هەڵهاتنی تیشکی زێرینی بەرەبەیانی ١٧-٣٠ تەمموزی پیرۆز، کەلەلایەن حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستەوە بەرپابوو، هەرلەو ڕۆژەوە مژدەی ئازادیو پێشکەوتنی ئینسانی عێراقی بەکوردو عەرەبو کەمایەتیەکانیەوە پێ بەخشراو ڕەگو ڕیشەی ڕەسەنایەتی هێندەی تر بەخاکدا چوو، باڵای دارگوێزو خورما بەرزتر بوو هەموو شتێك ڕوی لەهەنگاو نانو داهێنان کرد، ئەم هەموو گۆڕانو پەرەسەندنەی بەختیاری ژیانی عێراقیەکان لەبەر ڕوناکی بیری پاڵەوانی سەربڵند ( سەدام حسین ) ی رۆڵەی بەجەرگ تیشکی دایەوە .

( سەدام حسین ) ئەو قارەمانە شۆڕشگێرەیە کەترسێکی گەورەی خستوەتە دڵی زایۆنیزمو دوژمنانەوە . ئەوەتا لەماوەی ئەم بیست ساڵی بەرپابونی شۆڕشە مەزنەکەی ١٧-٣٠ تەمموز هەموو راستیەکان لەبەر چاون هەرلەبنیات نانی شارستانیەتەوە تا داهێنانی زانست لەولاتدا، هەروەکو وتمان ئەمە حەقیقەتەو لەبەر تیشکی خۆرا ئەدرەوشێتەوە ئەمە عێراقی ( سەدام حسین) ە هەموو شتێك لەسێبەریا ڕۆشنەو هەڵوێستی مەبدەئی تیا ڕوونە .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ . ژمارە ٩ لاپەرە ٣ ساڵی ١٩٨٩ .

## سەرکردەو سوپاو سەرکەوتن

وریا سەعدلأمحەمەد

سەرکردەی گەلو خەباتگێر ( سەدام حسین ) دەڵێ :ئێمە نامانەوێت سوپای عێراق تەنیا بەرگری لەسنووری عێراق بکات، بەڵکو دەمانەوێ سوپا ببێتەشێری دەریا دژی دوژمنان : شتێکی ڕونو ئاشکرایە کەیەکێك لەو هۆیانەی کەبووە بناغەی سەرکەوتنەکانمان لەجەنگی ( قادسیەی سەدام ) دا سەرکردایەتی کردنی وریایانەی سەرەکی فەرماندە ( سەدام حسین ) بووە .

کەهەر لەرۆژی یەکەمی جەنگی ڕەوامانەوە بەو پەڕی دانایی‌و بەشێوەیەکی ورد وەکو ڕابەرێکی دڵسۆز توانی وەکو ئەندازیارێکی سەربازی بەتوانا ڕابەرایەتی جەنگ بکا، جگەلەوە سەرکردەی گەل بەوپەڕی تواناوە ئامۆژگاری‌و راسپاردەی بەجێی پێشکەش کرد .

ئامادەبونی لەزۆربەی سەرکەوتنەکانماندا بووە هۆیەکی گەورە کە جەنگاوەری عێراق بە ورەیەکی بەرزەوە بچێتە بەرەکانی جەنگ، چونکە سەرکردە ( سەدام حسین ) خۆشی لەگەڵیاندا لەسەنگەردابوو، راسپاردەکانی سەرەکی فەرماندە نەك تەنیا لەڕوی سەربازیەوە بوو، بەڵکو هەمیشە لەنزیکەوە ڕاستی ئەوەی بۆڕوون کردینەوە، کەعێراق لەپێناوی هەقدا شەڕ دەکاو لەسەر ئەو بنەرەتە جەنگاوەری عێراق چەك هەڵدەگرێ............ تادوای .

تێبینی :رۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٢٢ لاپەرە ١١ .

## جەژنی سوپا جەژنی سەرکەوتن

**هەڵمەت محەمەد**

جەنگاوەری ئەمڕۆی عێراق بەباوەڕ شەڕ دەکا، بۆیە لەهەموو هەنگاوێکیا سەرکەوتن تۆمار دەکات، سەرکردەی کاروانیش هاوڕێ ( سەدام حسین )هەمیشە لەتەك جەنگاوەری بەجەرگی عێراق لەدروست کردنی سەرکەوتندا نەخشەی ئەندازیاری سەربازی کێشاوە، ئەمساڵیش کەیادی جەژنی سوپای هەموو گەل دەکەینەوە، دووبارە وێنەی ئەو جەنگاوەرە گەورەیە دەبینین کەچۆن بەخوێن قوربانی دەدات .

بۆیە لەجەژنەکەیدا هەموومان بەتێکڕا گۆرانی خۆشەویستی دەڵێین، چونکە سوپا مەدالیای سەرکەوتنمانە، ئاهەنگی جەژنی سوپای دلێر ئاهەنگی سەرکەوتنەبەسەر ئەو ڕژێمە بۆگەنەی ڕۆژ بەڕۆژ سوپاکەی بەرەو شپرزەبون دەچێتو ناتوانێت لە سەر چۆك بوەستێت، چونکە عێراق هەموو کات لەهەڵوێستی هێزەوە رادەوەستیّو بەرپەرچی دلێرانە دەداتەوە و خەونی کورتە باڵاکانی ئێران دەپوکێنێتەوە، ئەو جەنگەی کە ئێران سەپاندی بەسەر سوپاکەماندا بەتەواوەتی ڕوونی کردەوە کە سوپاکەمان چەندە بەوئازایەو ڕووبەڕووی گێژەلولی زەردی ئێران بوەتەوە .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٢٢ ، لاپەرە ، ١١ .

## گەلی کورد ملکەچ نابیّ

وریا دڵپاك

بۆئەوەی دەوری پیرۆزی خۆی لە داستانی قادسیەدا ببینیّ دوژمنانی عیّراق گەلیّکیان بەلاوە سەیربوکە بە کارەساتیّکی گەورەیە کە کورد بچیّتە ژیّر سیّبەری شۆڕشەوە، ئەو شۆڕشەی کەعیّراقی خستە قۆناغی ترەوە و ژیانی ئاسودەی بۆکورد هیّنایە دی.

ئەو شۆڕشەی کە گەلی کوردی لە زیلەت ڕزگارکرد، هەموو هۆیەکی حەسانەوەو پیّشکەوتنی بۆ گەل کرد، ئەوانەی کەلەنزیکەوە گوییان لەوتەی ئەمجارەی (سەدام حسین) ی ڕابەرو پیّشەوا ڕاگرت، ئەگەر خۆیان هەڵنەخەڵەتیّنن دەزانن ئەم عیّراقە ئازیزە چ لوتکەیەکی بەرزە، چ ئەفسانەیەکە لەخۆشەویستی .

دەزانن ئەم عیّراقە ئازیزە بەئاسانی هەڵناوەریّت، ئەوەتانیّ گەلی کورد بەباوەڕ لەپیّناوی پاراستنی ئەم عیّراقە چەك لەشانە بۆبەرەنگار بونەوەی پیلانەکانی دوژمن لەسەروی هەمووشیانەوە ڕەگەز پەرستە داخ لەدڵەکانی ئیّران .

قوربانی دەدات، مل کەچ ناکا، گەلی کورد قوربانی دەدات بۆ پاراستنی عیّراقی لوتکەو عیّراقی هەمیشە ڕوو لەڕۆژی ئاسودەی .

تیّبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦، ژمارە ٨٢٤ ، لاپەڕە ٢ .

## لەبەر ڕوناکی وتەبەنرخەکەی سەرۆکی فەرماندە سەدام حسین دا نیشتیمان پەروەری لەنێوان ئەرك و مافدا

**عەبدلاّ عەباس**

ڕۆژی ١٩٨٦\١١\١٥ سەرکردەی گەلی عێراقی مەزن ( سەدام حسین ) لەکاتی بەخشینی نیشانەی ڕافیدەین و مەدالیای ئازایەتی بەدەستەیەك لەو پاڵەوانانەی تەقەلای نمونەیان دا لەهاوکاری کردنی هێزە چەکدارەکانماندا دژی دەست درێژی دوژمنی ئێران، وتەیەکی گرنگی ئاراستەکرد .

سەرەکی فەرماندە لەوتە بەنرخەکەیدا ڕوناکی دەخاتە سەر عێراقی مەزن، عێراقیەکان لەمانای هەرە ڕاستی نیشتیمان پەروەری گەیشتن بەیەکسانی هەڵسوکەوت کردنیان لەگەڵ ئەرکو مافەکانیاندا لەنیشتیمانە مەزنەکەیاندا کەعێراقە .

هەروەك سەرکردە لە وتەیەکی تری بەنرخیا دوپاتی کردەوە هیچ کەسێ هیچی بەسەرعێراقەوە نیەو نابێت راسپاردەو ئامۆژگاریەکانی سەرکردەمان راسپاردەو ئامۆژگاری حاکم نیە بۆگەلەکەی بەڵکو بیرکردنەوەو ئاراستەکردنە لەناو گەلەوە لەپێناو سودی هەرەبەرزی گەلدا کە پاراستنی سەربەرزیو سەربەخۆی گەلو نیشتیمانە، ئەم عێراقە نوێیەو عێراقی پەروەردەبوو لەبەر ڕوناکی ئەم بەها پیرۆزانەدا حەقی خۆیەتی ئەوپەری شانازی بەبیروباوەڕو ئازایەتی خۆیەوە بکات .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٢٥،لاپەرە٤ .

## سوپای میللی و گیانی سەرکەوتن

خەسرۆ باپیر

ڕاستیەکی هەرە دیار ئەوەیە کە ئەو جەماوەرە بەباوەری هاتە ریزەکانی سوپای میللی ناتوانرێت لەناو بچێت، بەڵکو دەستێکی هێندە پۆلاینە کەخەونی دوژمنان زیندەبەچاڵ دەکات، بۆیە دەتوانین بڵێین دامەزراندنی سوپای میللی لەگەڵ بارودۆخی تازەدا، بەتەواوەتی یەکتری گرتەوە .

کێ بێگومان باوەری مرۆڤی عێراقی تازەکردەوە بۆقوربانی دانو ئامادەکردنی بەو شێوەیەی کەسەردەمی ئێستا داخوازیەتی، بەلام لەجەنگی ( قادسیەی سەدام)ی پیرۆزدا ئەوەی شتێکی رونو ئاشکرایە کە سوپای میللی بەشدار بوو لەپاراستنی هێمنی باری ناوخۆیو بەرەکانی کوشتاردا بۆماوەی شەش ساڵ دەجەنگێتو لەزۆربەی سەرکەوتنەکاندا چیرۆکی پاڵەوانی تۆمار کردوە .

سوپای میللی بوارێکی لەبار بوو بۆهەموو عێراقیەکان کەدەوری خۆیان بینی لەبەشداری کردنی جەنگی ( قادسیەی صدام )و گیانی سەرکەوتن، گەلەکەمان لەگەڵ تێکرای ئەرکی نیشتیمانیدا یەکتری گرتەوە لەوەستانی مەردانەو بەرەنگار بونەوەی نەخشەی دوژمن .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، لاپەرە ٦ . ژمارە ٨٢٧ .

## بوکی شۆڕشەکان

نەوزاد رەووف

ئـەوەتا هــەروەکو بینیمــان لەیەکــەم رۆژی لــەدایك بــوونی شۆرشــی ١٧-٣٠ ی تــەمموزی نــەمردا دوژمنــانی گەلەکــەمان بــەدەیان کۆسـپو دڕکـو داڵیــان لــەرێگای شۆڕشدا چاند، بەڵام لەراستیدا شـۆڕشو پاڵـەوانانی بـەعسو گـەلی نەبـەزی عێـراق ئەوەی چەسپاندا کەلەهەموو پیلانو نیـازی خراپیـان بـەهێزترەو هـەرگیز دوژمنـان ناتوانن خەونە نارەواو چەپەڵەکانیان بهێنە دی .

ئەوەتا ماوەی شەش ساڵە قارەمانانی قادسیەی دووەمو لەژێر ئالأی هەڤاڵی دانـا ( سەدام حسین ) ئەوپەڕی سەرکەوتن دروسـت دەکـەنو لـوتی دوژمنـی شـکاندوەو ئەوەی بەتـەواوەتی دووپـات کردۆتـەوە کەهێزنیـە لەسەرانسـەری دنیـادا بتوانێـت خاکی پیرۆزی عێراق گلاو بکات .

پـارتی بـەعس بۆئـەوە لـەدایك بـوە کـە سـەرکەوتن بۆگەلەکـەمان بخولقێنێـتو هەتاهەتایە بەسەربەرزی و سەرفرازیو بەکامـەرانی بـژیت، هـەزار سـڵاو بۆشۆڕشـی هەشتی شوبات لەیادی لەدایك بونیدا، هەروەها بۆدەسکەوتەکانی بـوکی شـۆرشمان دەتوانین بڵێین ئێمە بەوپەڕی شانازیەوە دەتـوانین باسـی ئـەوە بکـەین کەشـۆڕش لەنیشتیمانەکەماندا توانی دەوری نەتەوایەتی پێشڕەوی ڕەسەن بگێڕێت .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری : ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٢٧ ،لاپەرە ٨ .

## بۆ جەژنی سوپای میللی

دڵشاد مەغدید

باوکم عومری حەفتاساڵە جەنگاوەرە
برام هێشتا مێر منداڵە لەسەنگەرە
دایکم کێکو کولیچەیان بۆدەنێرێ
رۆڵەکانی بەیەزدانی پاك ئەسپێرێ
ئێمە هەموو گەورەو بچوك جەنگاوەرین
لەرێی بەرزی نیشتیماندا گیان پەروەرین .

## سوپای میللی

**محەمەد سۆفی**

بابە کەچەکت ئەکەیتە سەرشان
ڕوناکی ئەدەی بەناخی ژیان
ڕێی ئازادیمان بۆئەکەیتەوە
ڕۆژی ڕوناکمان بیرئەخەیتەوە
لەتەنگانەدا ئەبیتە چرا
بەهیمەتی تۆ مەشخەڵ هەڵئەکا .
لەریزی سوپا زۆر بەسەر بەرزی
هیوامان وایە هەرگیز نەبەزی

**تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ،ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٢٧ ، دوالاپەڕە .**

## عیراقا سەرکەفتنی

عبیدلا حسن عەلی دۆسکی

نهۆ پیڤەهین زانابن
نەل ناڤ کولوزانابن
بەلاڤ بن هەمی درابن
دگەل دوژمنی دزانابن
بو (سەدامی )مەسۆزا دی
مەسوند خاری ب خودای
ئەم بەرنادەین مللەتی خۆ
بو ئارمانجا مە دانای
خوینی دەرژی وەك روبارا
گوه نادەینە چ زێمارا
دێ سەرکەفین سەرێت چیا
خوش کەین دلێ ولاتیا
ئەز دەرمان ناکەم برینا
دێ هەرکەم هزرو تەخرینا
بێژم میللەتێ من کانێ؟
بو عیراقێ ئەز وەکو دینا

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، سالی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٢٨ ،لاپەرە ١١ .

## عيراقا من

ئيبراهيم محەمەد عامر

قەد جهى خو
ئەم بەرنادەين بۆ دەجالا
ئا د ڤێرەدا
دزڤروكا ڤەژينيدا
ئازادى دىٚ هەتەكرين
بو شەهيدكى ولاتى
ئا د ڤيره دا
جانىٚ مەزنىٚ شەهيدى كى
ژ شەهيدێت قادسيىٚ
دكەت هاوارو دەبيژيت
ئەزى ئێكم
ژ شەهيدێك وەلاتىٚ خو
ئەو وەلات ژى
داخازا وىٚ سەركەفتنه
ل سەر خوين مێژێت جيهانىٚ
ئومێدا وى هەر ئاشتى يه
ب سەرۆكايەتيا ( هەڤال سەداميه )
ئيتر سوپاس

تێبينى : رۆژنامەى هاوكارى ، سالى ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٢٨ ، لاپەرە ١٥ .

## سەرۆکی قوماندار

**سەفەر شەعبان یاسین**

هۆ سەربازێت ( قادسیا سەدامی )
تۆ بۆ دەسکەفیت شورشێ زێرڤانی
دژی خومەینیا دژی خۆش نێچیرەڤانی
هەڤال ( سەدام )تو روناهیا ڤي وەلاتی
تەئینیا ناڤ ژینا مەشادی
تورۆژەك نوی لمە هەلهاتی
ئەم ژی خەلکی کوردستانێ
بو جەنگی و سەرکەفتنی
دگەل تەینە هەتا مردنێ
ئەم دێ رابین دژی ئیرانی
هێرشی بەینە سەر تەهرانێ
دابستین مافێ کوردستانێ

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٢٩، دوالاپەرە .

## بەدڵو بەگیان لەگەڵ جەنگاوەرانی قادسیەداین

نەوزاد کاکە

عێراقیەکان بەردەوام بەدرێژای مێژوو ئێستاو لەپاشە ڕۆژدا بۆکارو فەرمانی قورس و گرنگو سەخت دەگەڕێن، ڕووبەڕوی شتی گرانو زەحمەت دەوەستن، بۆ سەرکەوتنی مەزنو نایابوگەورە، جالەبەر ئەمانە دەڵێین هەرگیز سەرکەوتنی ئاسانو هەرزانی لەهیچ شەڕێکدا وەدی نەهێناوە .

بەدرێژای شەری ڕەوامانداا گشت جەنگو شەڕەکانی لەو چەشنانە بوونە کە مێژوو شانازی پێیانەوە بکاتو لەلاپەڕە زێرینەکانی دا تۆماریان بکات، بگرە هەتا لەو شەڕە خێرایانەی کەسەرکەوتنی گەورەی لەماوەی چەند کاتژمێرێك دا وەدی هێناوە ڕووبەڕووی مانو نەمان بوونەتەوە .

ئێمەی عێراقیان ژیانمان لاخۆشەویستەو حەزمان لێیە بۆ خۆمانو بۆ ئەوانەی لەچواردەورماندا دەژین، بەڵام ڕەتی ئەم جۆرە شێوازانە دەکەینەوە کەدوژمنان بەچاوێکی سوکەوە سەیری گیانو خاکو کەرامەتمان بکەن .

ئێمە لەپێناوی ئەوەدا دەجەنگین بۆ ئەوەی هەمیشە سەر بەرز بین، سەرفراز بین، خاکمان لەچاو جنۆکان بپارێزینیو ئاڵای پیرۆزمان بەردەوام شەکاوە بێت، دەشزانین خۆبەخت کردنو شەهیدبوون لەپێناوی گەلو خاکو کەرامەتدا چ واتایەك دەبەخشێت، لەبەر ئەمانە جەنگاوەرانی قادسیەی دووەم لەماوەی شەشە ساڵی جەنگدا بەجوانترینو ڕەنگینترین شێوە بەرگری لەخاکی پیرۆزی خۆیان دەکەن .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٣٠ ، لاپەرە ٧ .

## هەربژی بەسرەی جوان

**هیوا عبدلقادر محەمەد**

هۆ بەسرەی جوان
هەی سوار چاکە ئازاکە
شیری تۆڵەت هەربلندەو هەربلند
سەری ئەو خەڵەفاوانە
قوت دەکا
کەدەیانەوێ داگیرت بکەن
هۆ بەسرەی جوان
هەی بوکی خوارووی وڵات
خوشکی باکوری وڵات
هەی برشنگداری رۆژهەلاتو
رۆژئاوای عێراق
هەی کیژۆڵە رەش تاڵەکەی عێراق
هەی بەسرە
تۆ درکیو دەچەقیتە ناو چاوی دوژمنان
هەموو عێراق حەزی لێتەو خۆشی دەوێی
گۆرانیت بۆدەڵێن سوارچاکانی ( سەدام حسین ) لەهەولێرو سلێمانیو
میسانو نەجەف .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٣٠ ، دوالاپەرە .

## گەورەترین شەر لەباشوری عێراقدا

### سەکینە مەنسور حسن

هەروەکو سەرەکی فەرماندە وقارەمانی عێراق ( سەدام حسین ) ووتیو فەرمووی کەئەگەر لەشەرەکانی تردا چەند نەفەرێکیان بەسەر شۆڕیەوە ڕایی کردبیّ ئەوا ئەمجارە ئەوەندەیشی بەچاوی خۆیان نایبینو ڕۆژگاریش ئەمە دەسەلمێنیّ، قسەکانی سەرۆکمان لەشوێنی خۆی بوو.

ئەمجارە نابیّ کەسیان بگەڕێنەوە کەواتە باشتر وایە بگەڕێنەوە لەڕێبازی چەوتیان دەست هەڵگرن لەدوژمنکاری یان، کە هەرگیز ملشکانی خۆیانو کاول بوونی ئێرانی تێدا یە .

بەتایبەتی پاش ئەو هەموو زیانانەی کەبەهێزە تێك شکاوەکەی گەیشت کە ژمارەی کوژراوەکانی چل و پێنج هەزار کەس بوونو سەدوو پەنجا هەزار بریندار، جگە لەچەكو ئامێرو فرۆکە هەزاران سلاو بۆ سەرۆکی گەل هەڤاڵی ڕێگای خەباتو تێکۆشانمان قارەمانی میلەت ( صدام حسین )و ڕۆڵە نەبەردەکانی بۆ ئەو سەرکەوتنانەی کەلەبەری فەیلەقی سیّ و حەوت وەدەستیان هێنا .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٣٤ ، لاپەرە ، ٣ .

## عێراقی خۆشمێرن

**عەلی محەمەد بەندی**

ئەی خومەینی نە بسلمان
تەدەما ناڤو نیشان .....؟
هند هیڤیا دکی بەس هەربێت باران
خوینێ پاڤژ بکت ژ کولانێت تەهران
هندی تۆپو تەیارێت تەبینین
چ جارا ئەم خونا ترسینین
توپرسیار بکە کائەم کین
نێ ئەم کورێت قوماندار ( سەدام )ین
ئەڤە سەرێ پێنج سالانە
شەری دکی لگەل عیراقیانە
تونابیژیت خوکوئەو بەلانە
هەر بکەڤین ناخون خومانە

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ۱۹۸٦ . ژمارە ۸۳٥ ، پەرە ۱۲ ،

## سەرۆك‌و میلەت

**بەدل محەمەد دۆسكی**

گەر پەزێ بێ شڤان بیت
گەلو بەرهەم نابیت
گەمیا بێ كەمیڤان
برا دێ هەر وەرگەربێت
لەشكەر بێ سەرۆك بیت
پاشكەفتن باراوی بیت
سەرەك كی یەو
دێ كی بیت
هەلگری ئالاڤی میللەت بیت
خەباتكەرو شورشگێر بیت
سەرەكی من ئالآ میللەتی بهەژینە
لسەرێ قاچیا هەر بچەقینە
ئەم هەڤالیت لەكوری میللەتینە
كلو دەردا توو بمرینە
...................... تادوای

تێبینی : رۆژنامەی هاوكاری ، سالّی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٣٨ ، لاپەرە ، ١٠ .

## بەند کردنی نرخی نەوت کارناکاتە
## سەر ئابوری عێراق

**نەوزاد هەڵەبجەیی**

ئابوری عێراق گەلێ بەهێزو گەلی عێراق ڕاستی بارو دۆخەکە دەزانێتو بەگوێرەی ئەم رادەیەو بەرزتریش رەفتار دەکات بەرەنگاری پیلانەکانیان دەبێتەوە، ئەوەش باش دەزانێت کەوا باری ئابوری و بەهێزکردنی هەرگیز گرنگیەتی لە گرنگیەتی لایەنی سوپای کەمترنیە، بەتایبەتی لەشکرێکی دوور و درێژو گەلێ ولآتان تیایدا بەشداری دەکات و یارمەتی دوژمن دەدەن .

هەروەها عێراقیەکان ئێستا بەچەشنێك کاردەکەنو چالاکی خۆیان دەنوێنن کەهەرگیز بەو چەشنە نیە کەدوژمنان پیلانیان بۆدادەنێن، عێراقیەکان لەژێر سایەی سەرکردەی دانا هەڤاڵ ( سەدام حسین ) لەقاوغی کۆنو لاسایی کردنەوە تێپەڕی .

بوونو لەهەرحاڵەتێکدا بەچەشنێکی نوێو بەرەفتاری شیاو گونجاو دەجولێن کەپشتی دوژمن پێی دەشکێننو سەرکەوتن وەدی دەهێنن .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٤٠ ، لاپەرە ٦.

## گفتوگۆیەك

عەبدلاّ سالّح شاربازێری

پێشکەشە بەشەهیدانی نیشتیمان
شەهیدانی رەوتی عێراقی مەزن .
لەناو سەنگەرێ
دیم کەللەسەرێ
خوێنی سور بەخوڕ
دەهاتە دەرێ
ئەوەندە جوانبو
ئەو کەللەسەرە
کەنەخشێنرابوو
بەو خوێنە تەڕە
وەك گولاّلە سورە
ئەدرەوشایەوە
کاتێ بەپەلە
چوم بەلایەوە
سلاوم لێکرد
بەزمانی خۆی
سەری کرنوشم
زوو دانەواند بۆی............ تادوای

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ، سالّی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٤٠ ، لاپەرە ٧ .

## تەمموزی بەخشندە .. تەمموزی سەرکەوتن

**ئاریان هەورامانی**

شۆرشی تەممورو سەرکردە قارەمانەکەی هەڤاڵ ( سەدام حسین ) گەلەکەمانیان لەچاوچنۆکەکان ڕزگارکردو سەربەرزیمان بۆ مایەوە و دوژمن نائومێد بوو لەمەرام و ئارەزوی نابەجێ و نامرۆڤایەتی دا .

شۆڕشی تەمموز خاوەن ئازارو خۆماڵی کردنی نەوت و خوێندن بەئیجباری و سەدان دەسکەوتی ترە چرای ئازادی و خۆشبەختی و کەرامەت بۆگەلەکەمانی هەڵگرتوە و بەردەوام نیشتیمانەکەمان لەسایەی دا ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر پێشدەکەوێ و هەنگاو بەرەو پێشەوە دەنێت و ڕێگای سەختی ژیان شەقارو لەت لەت دەکات .

بەدوژمنان دەڵێین با ئەوەیان بیرکەوێتەوە کەوا تیشکی خۆر بەبێژەنگ ناگیرێ، سلاو بۆقارەمانی گەل ( سەدام حسین ) لەجەژنەکانی تەممووزدا سلاو بۆجەنگاوەرانی قادسیەی دووەم کەئێستاو هەر لەم کاتەدا بەدەیان لەسوپاو ئالەتی دوژمن گۆڕدەکەن، سلاو بۆشەهیدانی نیشتیمان کەوا گیانی شیرینی خۆیان لەپێناوی خاک و شۆڕشدا پێشکەش کرد .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاورکای ، ساڵی ١٩٨٦ ، لاپەرە ١١، ژمارە ٨٤٨ .

## بەبۆنەی هەفتەی ( قادسیەی سەدام )

## بۆدەجال خومەینی

**مەسعود سالح ئامێدی**

هۆزان ڤانم شورەشڤانم
بۆ عێراقی بەرەڤانم
ئەز لەشکرەم ئەڤە هاتم
خودان ئاخم نەبێ وارم
من نەڤێت ترس من
نەڤێت برس
من نەڤێت عەجەم نەڤێت فارس
کاتەناهی ئەی خومەینی
ژیان خوشە تورزورداری
ئەز فوراتم رۆژهەلاتی
دیجامەئەز ژوودا
هاتم
ئەز وەك هەیڤم قەد
نارەڤم
ئەز نوی روژم نەرەش
شەڤم

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، سالی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٥٦ ، لاپەرە ٨ .

## عیراقا سەرکەفتی

حازم شەوکەت

عیراقا من وارێ نەمرا
سەرێ خوبلندکە لەناڤ دوژمنا
تویێ ولاتێ خەباتکەرا

بو وەیە سەرکەفتن گەلێ دلێرا
بکەن خەباتێ دگەل شورەشگێرا
دێ بسەرکەفین سەرنەیارا
دێ پارێزیم ئاخا پیرۆز
عیراقی مە ئەزم دلسۆز
بو خومەینی ئەزم جەرگسوز
چەپەریت دووژمنا بکەنە گوور
خوپەرێسا نەهێلن لژێرو ژوور
دیاری بۆ ولات خینا سوور
کوردوعەرەب ئێکن ب دلو ئەڤین
بسەرۆکاتیا هەڤال ( سەدام حسین )
دێ عێراقێ پارێزن دژی خومەینی

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٥٦، لاپەرە ٨ .

## تیشکێك لەسەر شۆڕشی ١٧ی تەمموز

**نەجدەت مجید**

دوبـاره شـتێکی زۆر تەبیعیـه کەشـۆڕش بـەقوڵی ڕەگ داکـوتیّو خـۆی بگرێـت، بەڵگـەی ئـەم ڕەگ داکوتانـه و ئـەم خۆگرتنـەش ئەوەیـه کـه شـۆڕش زۆر ئازایانـەو لێهاتوانـه لـەڕووی دوژمنـانو پیلانەکانیانـدا وەسـتاو بەربـەرەکانی کـردن، ئـەو پیلانانـەی کـەهێزه دوژمنـەکان ئیمپریـالیزمی جیهـانیو زایـۆنیزو نۆکـەرەکانیان لەناوچەکەدا پێی هەستا .

لـەپێش هەموویانـەوە ڕژێمـی حـافز ئەسـەدو قـەزافی کەیارمـەتیو پـشتگیری دوژمنانی عێراقیان کرد لەپیلان گێراندا، ئەوەتە لەگەڵ ئەوەشـدا پیلانـەکان جـۆراو جۆرو دڕندانه بوون شۆڕش تـوانی کەبەتونـدی لـه ڕوویانـدا بوەسـتیّو بەرپەرچیان بداتـــەوە، ئازایـــەتیو مەردایـــەتیش لـــەم بەرپەرچـــەدانەوەیەدا دەگەڕێتـــەوە بۆسەرکردایەتی سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسێن ) و دەگەڕێتـەوە بـۆ زیرەکـیو لێهاتوویو وریاییو دووربینی ئەو .

دوا پیلانـی دژی عێراقمـان ئـەو شـەڕه دوژمنانـه بـوو کـەڕژێمی خومـەینی دژی وڵاتەکەمان هەڵگیرساندو عیراقیه مەردەکان ڕوو بەڕووی وەستانو پـەکیان خـست، ئەوەتە لەگەڵ ئەوەشدا کە زیاتر له شەش ساڵ بەسەر ئەم شەڕەدا تێپـەڕی کەچـی گەلی عێراق زیاتر بەهێزەو باشتردەست لـەدوژمن دەوەشـێنیّو ڕۆژ بـەڕۆژ شـێوەی تازەو دیاری بەکار دێنیّ بۆ لێدانی دوژمن و پەك خستنی .

تێبینی :ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٥٧،لاپەرە ٤ .

## عيراق وەلاتێ منە

## دیاری بۆلەشکری مەیێ قەهرەمان

**مقداد مەردان دێر گژنیکی**

وەلاتێ من
عیراقا رەنگین
وارێ ئەز لێ خودانییم
و مازنییم
چما دێ هێلم
ئەڤرو دوژمن
ل سەر بژیت
عیراقا من
جهێ شیرا
زێرەڤانیم
خرسنورا
ڤیرا ڤیرا
دێ توخوبێ خرێ
کەم خوین
داگەل ب تەسەربەست
بژین .............تادوای

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٥٧ ، لاپەرە ٧.

## بهەلکەفتنا هەفتیا ( قادسیا سەدام )

# ئاخ و خوێن

ئیحسان نعمان

مەزن بو زارۆکا نەبنە قوربان
هەمی نەگرێدەن ئێك سوزو پەیمان
دێ چاوا دورێت مەرەڤن کۆڤان
ئێ گەلو
خوینا من نە ئاڤەکو بچیت بەلاش
نەخێ دێبێ
شین ببین ئەڤ دارو تەراش
دێ ....... بیتە ئاڤ وپێ شول کەن هەمی ئاش
داخەمین دلێ من بهێرن باش
دێ خوینێ و ئاخێ تێکدا شێلین
ناڤو نیشانێت تە پێ نڤیسین
داتەل تەڤ جیهانێ بدەیتە نیاسین
کو ئەم عیراقینە و ناترسین

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری : سالی ١٩٨٦، ژمارە ٨٦٠ ، لاپەرە ٨.

## لەشكەرێ سەركەفتنا
## بهلكەفتنا ( قادسیا سەدام )
**حەمەد ئوسمانا**

وەلات پێكەڤەبو لەشكەر
توخیب هەمی كر چەپەر
دوژمن دورئێخست بشەر
ژین ل وان كر كەسەر
كورێت عێراقێ شێرن
زەندوپێلاو تبل كێرن
مەژی لخومەینی دهێرن
بلا بێن گەر ب وێرن
لەشكەرێ ئازادیێ
لەشكەرێ سەربەستێی
بۆمە سازكە سەركەفتنێ
تەناهێیو ئاشتێ
سەركەفتنێ چێكەئەی لەشكەر
خۆژ بن زولمی بینەدەر
بەسە نەبن دەر بەدەر
روناهیی بیخە دەڤەر

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوكاری ، ساڵی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٦٠ ، لاپەرە ٨.

## من پسيارکر
## پشکێشه بو لەشکەری عيراقیٚ يیٚ قارەمان

نەسرەدين هادی

من پسيارکر
هو چياوو
بو چی دارێن تە خرش بوينە
بەری نادەن
بۆشکەفتێن تە
بیٚ دەنگ بوينە
دەنگ ڤەنادەن
عەوریٚ ل هنداڤی سەرێتە
يیٚ تاری بوی
باراناوی نابەریتن
برپيسێن وی لدور گەليا
شەوقیٚ نادەن
ئەریٚ ماهوين لقێريا نادەن
وی گۆتە من
................ تادوای

تێبينی : رۆژنامەی هاوکاری . سالی ١٩٨٦ ، ژمارە ٨٦٠ ، لاپەرە ٨ .

## تاقمە حوکمرانەکانی تاران‌و
## پاشگەزبونەوە ڕووڕەشانەو ترسنۆکانە .

**عبدلکریم عەبدلآ**

ئێستاش دەڵێن گوایە ئەم ساڵ ساڵی بەیەك لادا کەوتنی جەنگ دەبو، کەچی سەرکردایەتی سەرۆکی تێکۆشەر ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت بەیەك لادا کەوتنەی جەنگی بەبەرژەوەندی عێراقی عەرەبی‌و ئیسلامی کەوتەوەو هێزی زەمینی‌و ئاسمانی‌و دەریایمان داموەزگاکانی دوژمنیان بۆردوومان کردو گڕیان تێبەردا .

سەرکردەی تێکۆشەر ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت فەرماندەی گەل‌و سوپا دەکات‌و قارەمانی ئەو لەخۆ بەرگری کردنەیە، هەموو جیهانیش ئاگاداری ئەوەن کەئەوان دەیانگوت ئەم شالآوە دوا شالآو دەبێت، کەچی بیست‌و دووجار هێرشیان کرد هەرجارەی ئەوەندەی پێشوتر زیانیان لێدەکەوت بەریسوایی دەشکان‌و دەکەوتن‌و ئەنجام ریسوا بوون‌و درۆیان دەرکەوت .

ئەم قسانەشیان هەموو پوچ بونەوە کە گوایا ئەم ساڵ ساڵی بەیەك لادانە کەوتنی جەنگ دەبێت، بەدەستی ئەوان چونکە ئەو قسەیان هیچ بنەمایەکی نەبوو، دەیانەوێت گەلەکانی ئێران بەو چەشنە بخەڵەتێنن .

بۆیە ئێمە هێشتا بەرەنگاریان دەبینەوە وەك سەرۆکی تێکۆشەر ( سەدام حسین )ووتی: لەبەرەی جەنگدا کۆتایی بەجەنگ دەهێنرێت‌و خودا یارمەتیمان دەدات سەرکەوتنیش هەربۆ ئێمەیە .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٨٦ . ژمارە ٨٦١، لاپەرە ٥.

## بۆ سەرکردە

**ئەنوەر ئەمجەد دەرگەڵە**

لەمناڵەوە تاپیر
لەدەشتای بۆبیابان
خۆشیان ئەوێ ی بەقەت چاوان
هەموو بەتۆوە ئەنازن
یەك یەك گۆرانیت بۆدەڵێن
تۆهەرسەرکردەیەك نی
تۆ بوونمانی
تۆ ناسنامەی
تۆ هەموو عێراقی گەورەی
تۆئێمەیتو
ئێمەش قوربانی گەورە
شیو نیە
بگاتە خۆشەویستی تۆ
بگاتە گەورەی تۆ
بالآت بەرزە
خۆزگەت مەزن .
..............تاد

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٨٦، ژمارە ٨٦٥،لاپەرە ٦.

## سیٚ دەنگ بۆ شەهیدی

ئسماعیل زاخۆیی

نیٚ هوزانا دگەل خود ئینیٚ
لێرکی دا تود ڤەهینیٚ
بو سەرۆکی تۆ دڤەهینیٚ
بۆ( سەدام )ی تۆ دڤەهینیٚ
ئەی شەهید تو ساخی تو چ جا
نامری
ستێرەك گەشی ل عەسمانا نا
ڤەمری
عێراق ئاڤابی بخوینا ئە
گولو ریحانا دیٚ چینم لدووریٚ تە
دیٚ شین بن دیٚ هەر خەملت
بخوینا تە
لسەر بەلکیٚ وان گولا گەشە
ناڤیتە .
........................ ماویەتی .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری .ساڵی ١٩٨٦ . ژمارە ٨٧٠. لاپەرە ١٠.

## ( سەدام حسين )لەدلْماندا دەژی

**سۆران سيروان**

عێراقی خۆشەويست عێراقی سەرکردەی ( سەدام حسين ) لەسايەی سەرکردەی لێهاتوو دا سەرۆکی تێکۆشەر فەرماندە ( سەدام حسين ) لەوپەڕی بەختياریو شادومانی و ئاسودەيدا دەژی، چونکە وەك لای هەموو جيهان ئاشکرايە سەرۆکی بەڕێز بەپاڵەوانانی ئاشتیو سەرکەوتنو بنيات نان لەجيهاندا ناسراوە .

لەسايەی باوەڕی پيرۆزيدا عێراق لەماوەيەکی کەمدا گەياندەوە بەڕێزی زۆر لەو وڵاتانەی جيهانو هەرلەشاری فاويی سەرکەوتنەوە تاکو خاکی زاخۆی خۆشەويست، مۆرکی عێراقی نوێی پێوەدیارەو لەهەموو ڕويەکی ژيانەوە هەنگاوی خێرای ناوە بۆپێشەوە، بۆيە گەر ئەم سەردەمە بەسەردەمی عێراقی زێڕينی سەرکردە ( سەدام حسين ) ناوی ببەين دەگونجێت .

ئەوەتا هەرلەمندالو ئافرەتو لاو پيرەوە لەعێراقدا بەيەك دەنگ هاواردەکەنو دەڵێن بەڵێ بەڵێ تۆمان دەوێ ئەی سەرکردەی تێکۆشەرو ڕزگار کەری عێراقو قارەمانی سەردەم، بۆيە ئێمە ڕای دەگەيەنين نەك هەر مالو قوتابخانەو دەزگاو ديوارەکان وێنەی خۆشەويستيمان هەڵدەواسين بەڵکو وێنەيەکی ديش لەناو دلْماندا جێگەی هەيە .

تێبينی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ١٢٠٥ ، لاپەرە ٤.

## عێراقی ئەمڕۆ

ڕزگار محەمەد

ئەم هەڵوێستەی عێراق کەسەرکردەی خۆشەویستمان ( سەدام حسین ) ڕەمزی شکۆمەندی عێراق سەرکردایەتی دەکات کارێکی مرۆڤایەتی ڕەسەنەو هەروەها خاوەن دووربینیەکی شارستانی قوڵەو ئەمەش بوەتە هۆی بەشدار بوونی جەماوەری پان و بەرین کە هەموو لایەکی نیشتیمانی عەرەبیو جیهانی ئیسلامیو هەموو جیهاندا لەگەڵ خێرخواز شان بەشانی دژی ئەو پیلانەی ئیمپریالیزمو زایۆنیزم بوەستن .

هەموو ئازادی خوازانی نەتەوە هەرگیز سەربۆ دوژمنان نانەوێنو هەرگیز نابنە داردەستی چڵکاو خۆرانو ئاغاکانیان و مێژووی پرشکۆمەندیو لاپەڕەی پرشنگداری تێکۆشەرانی ناسیاویان وا هەمیشە لەترۆپکدایەو سەرکەوتنیش هەربۆ ئێمەیە .

هەرچەندە دوژمنیش هەوڵبدات ئازاری عێراق بداتو ئابلوقەی ئابوری بدات هەرگیز کار لەڕووی بەرزی عێراق ناکاتو مێژوو قەت ڕەحم لە خۆفرۆشان ناکاتو ئێمەش ڕۆژ بەڕۆژ بەدوای بڕوامان بەسەر کەوتن بەهێز دەبێت .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ١٢٠٥، لاپەرە ٤.

## دەستوورو بەڵێنی سەرکردە .

کاوە فاتح جەباری

هەروەکو سەرکردە بەڵێنی بەگەلەکەی دابوو کەئەمە هەڵسوکەوتی شۆڕش بوە لەگەڵ ڕۆڵەکانیدا، گفتوگۆی سەرکردایەتی حیزبو لەمەڕ دەستوورەوە کۆتایی پێهاتو پەخش بوو بلاو کرایەوە .
تاوەکو لەبەر دەستی هەموو عێراقیەکان بێت بۆ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە و بیروڕا دەربڕین دەستوور بەهەنگاوێکی پێشکەوتو و دەسکەوتێکی مەزن دەژمێرێت، شۆڕشی ١٧-٣٠ی مەزنی تەمموز دوپاتی مەسەلەی دیموکراتی کردوەو بەهەنگاوێکی سەرەکی لە قەڵەمی داوە بۆبنیات نانی کۆمەڵگەی نوێو مرۆڤ ئەم کۆمەڵگایەو زیاد کردنی بەشداریەکانی لەبنیات نانو پەرەپێدانیو بەگەڕخستنی وزەو داهێنانەکانی .
گومانیشی تێدانیە لێکۆڵینەوەی جەماوەری دەربارەی دەستوور دوای تەواوبونی لێکۆڵینەوەکانی ترلەسەر ئاستی سەرکردایەتیو ئەنجومەنی وەزیرانو هەروەهایش ئەنجومەنی نیشتیمانی و یاساداناںو ڕێکخراوەمیللیو جەماوەریەکان بەشداری لەخەملاندنو چەسپاندنیەوە دەکات..........هتد.

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ١٢٠٥، لاپەرە ٤ .

## عێراقی کوردو عەرەب
## عێراقی هەڵوێستو جوامێری

**شەهاب عوسمان**

لەبەڵگەنامەکانی ( ئۆکس پایکدا ) پەردە لادانێك بوو لەڕوی ویستو نیازە گلاوەکانی ئەمریکادا بەرانبەر بەگەلی کورد، هەموو ئەمانەو دەیانی تر لەپیلان بۆ دەستبەسەراگرتنی عەقلیەتی ئینسانی کوردو تێکدانی حەسانەوەو ئارامیو ئامێزی ئۆتۆنۆمی ودابڕانی گەلەکەمان لە ( سەدام حسین )مایە پوچ دەرچوو .

چونکە شاری سلێمانی گەورەترە لەمەسەلەکانی ڕاگەیاندن بەهەستو سۆزێکی بێوێنەوە ڕژانە سەر شەقامەکانو دەنگی نارەزایەتی دژی ئەمریکاو بەریتانیاو سەهیۆنیزم دەربڕیو ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆچەك هەڵگرتن لەدژی هەموو ئەو پیلانانەی کە دەکرێتە سەر عێراق .

هەڵچونی شۆڕشگێڕانە ئاوێتەبو بەجوامێریو بیری وردە تێڕوانینی دڵسۆزانەی سەرکردە ( سەدام حسین )، دوور لەهەموو مەسەلەیەکی پڕو پاگەندە وخۆدەرخستنێك لەبەردەم ئاژانسەکانو ڕۆژنامەو دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بەڵێ کۆبونەوەی شەممەی ڕابردوو کۆمەلانی خەلکی سلێمانی و ڕۆلە قارەمانەکانی هەرلەو سەدانو سەدان کەسەوە کەچەکی سوپای میللی کردبوە شانیو لەرەوتی شۆڕش گێڕانەو ڕێ ڕۆیشتنی سەربازیانەیدا بەرجەستەی هێزو توانای عێراقی سەرکەشیانن دەرخست........

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٩٠ ، ژمارە ١٢١٠، لاپەرە ٣.

## ئەمریکاو قوبلا شەریف

ئبراهیم عەلی هاجانی

ژ عێراقی عێراقی هاریکاریا شۆڕشوان کربکەن پشتی چەند ڕۆژا ژ شۆرشی حکومەتا کوێتیێ یا سەربەخۆ داخاز کر ژ عێراقیێ کوێت وعێراق بیت بازێرەك ژ بازێرێت عێراقیێ هەروەسا عێراقیێ ژی بسەرۆکایەتیا قوماندار ( سەدام حسێن ) خودێ بهیلێت ل هەشت تەباخیێ بریارا حکومەتا کوێتیێ قەبیل کردو قوماندار یا شورشیێ بریاردا کوێتو عێراق ببن بەیەك .

کوێت ژ ڤێری جارەکا بۆ عێراق چ مفا نەکربۆ رەڤدەکا ئەلسباح و چەپەل فەهدو مبارەك نوکەرێت ئەمریکاو زایۆنێن رابێن داخاز ژ ئەمریکا و ئینگلیزا کرد هێزێت وانبێن د جەزیرا عەرەبیا داو دەستێ خوەدان سەربێرێت نەفتیو کورسیکا چ یەك مەلیك فەهدی بپارێزیت .

ژ ئێرشێت عێراقیێ خوە بکێشنو ژ کوێتیێ و جارەکا دی رەڤدەکا ئەلسباح بزفرنەفەو نوکەر بکەیفا خوە بکەڤن ددەڤەرا خەلیجی وەکی بەری عەرەب ببن خولاڤێت ئیمپریالیزم. ئەڤە هەمی بنانەهیا خودێ مغاناکەن بووناو عێراق بگورێت ڤەبین مێرخاسیێ و ژێرەك دێ سەریێ و نا شورکەنو دێ شەرمەزاری ژ ڤرن بۆ بنگەهێن خوە بدل شکەستیو رووی رەش .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٩٠ ، ژمارە ١٢١٠، لاپەرە ٦.

## عێراقیەکان شێری ئیمامی عەلیان لە دەستە

**گۆڕەز ڕەواندوزی**

بەڵام عێراقیەکان بەکوردو عەرەبەوە دەست لەنێو دەست لەژێر ئاڵای شێری زەمان ( سەدام حسێن) هەرلەزاخۆوە تاسەر کەنار دەریاکانی شارەکانی ئەل نداو عبدەلی تادوا تنۆکی خۆیان بەرگری لەو خاکە ئەکەنو نوکی خەنجەر و شیرەکانیان ئەچەقێنە بیل بیلەی چاوی چاوجنۆکان .

وەهەرگیز بەوە ڕازی نابن خاکی پیرۆزی پیاو چاکان بکەن بەقاوەخانەی خۆیانو بەپۆستاڵی ڕەشی خۆیان بیشێلن، وەسەلماندوشیانە کەئێمە نەوەی پاڵەوانانی وەك سەعدو خالیدو سەلاحەدینی ئەیوبین، وە چۆکمان بەرانبەر هیچ هەڕەشەو گوڕەشەیەك دانانێینو سەنگەری مەردایەتیمان بەرنادەین .

مێژووش نکۆڵی لەوەناکات کە کوێتو شارەکانی بەشێکن لەخاکی عێراقو لێی جیانابنەوە، چونکە پاش کشانەوەی لەشکری هۆلاکۆی بەریتانیا لەساڵانی کۆن باری عێراق لەشڵەژانادبوو، کۆنەپەرستان هەرخەریکی کورسی قایم کردنی خۆیان بوون بۆیە ئیمپریالیزمی ئەمریکاش بەدرێنەدانی خۆیەوە ئەو تاقمەبەکرێ گیراوەی ئەلسەباحی خستە سەر کورسی .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ۱۹۹۰ ، ژمارە ۱۲۱۰ ، لاپەرە ٦.

## ئێمە وڵات پارێزین

**عەلی ئەمین بەرزنجی**

ناترسین لەبکوژان
رانەوەستین دژی وان
بۆبەرگری لەم خاکە
خوێن بەخشینمان لاچاکە
ترس نیە لەدەسەلأتیان
هەرچۆن بێت بەسەر هاتیان
ئێمە وڵات پارێزین
دژی گشت دەست درێژین
( سەدام )سەرکردەمانە
دژی داگیر کەرانە
هەموومان پشتی ئەوین
دژی زوڵمی سەرزەوین
پشت ئەستورین بەخۆمان
کۆڵنەدەرین بۆژیان

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ١٢١٠، دوالاپەڕە .

## عێراقا نویٚ

محەمەد سالّح شەرەفانی

ئەم کوریتڤی ولاتی نە
عیراقا نویٚ بومە ژینە
لەشکەرو خائینا بهەرشینە
عێراق مە تێکدا مێرکو کانینە
گولو نێرگزو بنەفشەوبەیبەنە
سەرۆك ( سەدام )تۆئالاْیە بهەژینە
(سەدام ) تو روناهیا ولاْتی
تو رۆژەك نویٚ لمە هەلاتی
دگەل دوژمنا تو ئاڤاتی
کوردو عەرەب ئەڤ بەئێکانیٚ
دیٚ عیراقی کەن ڕوناهی
کویتا مە زفری ب شاهی
وان جەنگا چەپەل لسەرمە هەلگرە
نەزانی ئیکا تیا عێراقی وەك کەڤر
دیٚ توخیبی تێکدا کەیە ئاگر .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، سالّی ۱۹۹۰. ژمارە ۱۲۱۰. دوالاپەڕە .

## بۆ شۆڕشگێڕە ئازادی خوازەکانی کوەیت

## گەلی عێراق پشتیوانتانە

**محەمەد دڵسۆز**

بەرپابونی شۆڕشی کوێت کارێکی ناوخۆیی و یارمەتی عێراقیش بۆ رۆڵە بەشەرەفەکانی کوێت ئەرکێکی نەتەوەیی بووە، ئیتر پێویست بەو گرمە گرم و پرتەو بۆڵەیە ناکاتو ئەوانەی بەرژەوەندی ئەو جۆرە رژێمانەیان دەپاراست دەبێت زۆرباش ئەوە بزانن ئەمڕۆ سەدەی سەربەستییەو دەبێت قوتی گەل بۆگەل بێت و خۆی سەرکردەی خۆی بکات و ئیتر باوی ورگ زلەکان و گیرفان پڕەکان نەماوەو لەو لایەنەشەوە هەموو گەلانی دنیا پشتیوانی یەکتری دەکەن.
ئەمڕۆش عێراق پربەهەموو دەنگی دلێری دووپاتی دەکاتەوە کە هەمیشە ئامادەیە بۆ پاراستنی مافی نەتەوەی عەرەبو لەو پێناوەشدا هەموو توانای دەخاتەکار و ئەوەش بیروڕای هەموو گەلو سەرکردەی خۆشەویست ( سەدام حسین )ە خوابیپارێزێت .
ئەو کاتەی ئازادی خوازانی کوێت راپەرینو بۆهەتاهەتایە سەرانی ئالسباح لەکوێت کرانە دەرەوە ، لەسەر داوای ئەو رۆڵە شۆرشگێرانەی کوێت سوپای عێراق بەهانایانەوە چوو، وەکو پێویستیەکی نەتەوەیی و پشتگیری تەواوی پیشانداو ئێستاش پاش پێکهێنانی حکومەتی سەربەخۆی کوێت عێراق پشتگیری خۆی پیشاندەدات بۆهەموو یارمەتیەك هەتاوەکوو لایەك بتوانن خزمەتی هەردوو گەلی کوێت و عێراق بکەن .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ١٢٠٢، لاپەرە ٢.

## بەڕێز سەرۆکی فەرماندە (سەدام حسین) خوابیپارێزێت و چاودێری بکات

**محسن تاهیر بەرزنجی**

بەناوی ڕۆشنبیرانی کورد، ئەندامانی کۆمەڵەکەمان پیرۆزبای لەگیانی سوارچاک و هەڵوێستە پاڵەوانەکانی خودی بەڕێزتان دەکەین، کاتێک کەبڕیارتان دابوو پشتگیری کردنی شۆرشی ئازادی خوازانی کوێت دژی تاقمە نۆکەرەکەی فەرمان ڕەواکانی کوێت کەخێرو بێرو سامانی کوێتیان دزی و خزمەتی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیەکانیان کرد .

ئەی سەرکردە لێوەشاوە بەڵێنتان دەدەینێ کەهەمیشە سەربازی وەفادار بین و خۆمان و گیانمان بەخت بکەین لەپێناوی خزمەتکردنی ڕەوتی شۆرشە مەزنەکەمان و تێکشکاندنی هەموو پیلانەکانی ئیمپریالیزم و پرۆژەی پرۆژە تاوانبارەکانی کەدەرحەقی گەلەکەمان دەکەن، هەربژین و هەربژیت عێراق و شۆڕشی سەربەستی کوێت.

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ١٢٠٢ ، لاپەرە ١١.

## حکومەتی شامیر حکومەتی جەنگە

**عارف لەتیف**

ئیسرائیلو دەربڕینــی ڕقو کینــە دژی عێــراق ئەمانــەش بۆمــان دەرکــەوت کــە ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا چەند درۆو پروپاگەندە لەڕۆژنامەو گۆڤارە بەکرێگیراوەکانیا دژی عێراقو نەتەوەی عەرەب بلاو دەکاتەوە کە گوایا عەرەب دەیەوێ دژیان بجەنگێ .

بەمــشێوەیە دەیانــەوێت جــەنگ بەرپابکــەنو ڕۆژ لــەدوای ڕۆژ بــەردوام بــن لــە ئەشکەنجەدانی ڕۆڵەکانی فەلەستینی بێ تاوانو لێدانی خــوارووی لبنــان بەفرۆکــەو تــۆپ هــەموو جــۆرە چــەكو خۆئامــادە کــردن بــۆ دەســتدرێژیکردن دژی عێراقــی سەربەست .

بــەلام بــا بــە خــەتی ڕەش خۆیــان تــاقی بکەنــەوە ئــەم ولاتــەش ولاتــی ( ســەدام حسین)ە و قەت لەسەر شتی ناڕەوا چاویان لێك نانێنو بەهەموو هێزو تواناو چــەکی کیمیاوی جووتــەك وەلامیــان دەدەینــەوەو ســەرکەوتنیش هــەربۆ عێراقــی نەتــەوەی عەرەب دایە .

ئەو ڕاستیەش ئاشکرایە کەبلاو بوونو دەستدرێژی بەلگەیەکی ڕوونە لەسیاســەتی زایۆنی بەلکو لەناخی ویژدانی زایۆنی ڕەگی کوتاوەو زەمینە خۆشــکردنی سیاســیو دەرونی یە بۆ دەستدرێژی کردن .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٩٠ . ژمارە ١١٩٦، لاپەرە ٢.

## عێراقی یەکێتی و سەربڵندی

**وەلی ئیسماعیل**

دوپـات کردنـەوەی سـەرۆکی فەرماندە ( سـەدام حـسین ) خوابیپـارێزێ لەسـەر ڕوخانی کـاری جموجـوڵی ئیمپریـالیزمو زایـۆنیزم لەناوچـەکەدا بەرانبـەر کاریگـەری بڕیاری یەکێتی ئەمڕۆ ئەمەش لەهەست کردن بەراستی دووربینی نەتەوەیی لەلایـەن هەموو عەرەبیەك لەمەحیتەوە تاکو کەنداو ئەمەش بەروخاندنی وەهمێکی گەورەیە کە دوژمنانی نەتەوەی عـەرەب نەخـشەیان کێـشابوو بەرانبـەر کاریگـەری عـەرەبی نوێو توانای لەهەڵبژاردنی ڕاستی نەتەوەو دووپاتکردنی ئامـادەبوونی لـەبوارەکانی جموجوڵی شارستانیەت و مرۆڤایەتیدا.
بەڵێ عێراقی ئـەمڕۆ لەهـەموو ڕۆژەکـانی ڕابـردوو بـەهێزترەو وەڵامدانـەوەمان بـۆ پیلانی دوژمن گەورەترە لەوەی کـەبیری لێدەکەنـەوەو سـەرکەوتنیش هەمیـشە بـۆ مافە ڕەواکانـە دژی هێـزە شـەڕ خوازەکـانو ئیمپریـالیزمو زایۆنیزمـدا، و عێراقـی ( سـەدام حـسین )و لەگەڵیـشدا هـەموو ڕۆڵـەکانی نەتـەوە ڕاسـتیەکی مێـژووی تۆمـار دەکەنو ئەوانەش کە درك بەراسـتی ناکـەن پەشـیمان لەسـەرکردەوە ناپاکـەکانیان دەبنەوە کاتێ گەل دەیانهەوێتە پشتی سنووری مێژوو ڕاستیو ڕابردوو.....هتد

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری .ساڵی ١٩٩٠ . ژمارە ١٢٠٢. لاپەرە ٢.

## شۆڕشی تەممووز توانا و سەرکەوتن

نەوزاد قادر

گەلەکەمان ونەتەوەی عەرەب دڵخۆشیو شادی خۆیان بەم بۆنە مێژوویە پیرۆزە دەردەبڕنو ئامەنگی شادیو سەرکەوتن دەگرنو ئەو ڕاستیە دەگەیەنن کەشۆڕش لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا بەجۆرەها ئەزمونی سەخت تێپەریوەو ئەنجامیش سەرکەوتنی وەدەس هێناوەو ڕەگی لەناو ژیانی جەماوەری گەلەکەمان کوتاوە .
جەماوەرێك کە لە دەوری شۆڕشو پێشڕەوە گەورەکەی فەرماندە ( سەدام حسین ) کۆبونەتەوەو بەرگری لەشکۆمەندیو سەربڵندی عێراق دەکەن دژی هەڕەشەو گوڕەشەو ئیمپریالیزمو زایۆنیزمی تاوانبار کەجۆرەها پیلانو کۆسپ دژی عێراقو پێشکەوتن دەگرن .
شۆرشی ١٧–٣٠ی تەمموز بەسەرۆکایەتی بەرێز سەرەکی فەرماندە ( سەدام حسین ) گۆڕانکاریەکی قوڵو فراوانی لەکۆمەڵی عێراقیدا کردوەو ئەمەش بەهەوڵو تەقەلایەکی بێ پایانو ژیرو بڕیاری نەبەز .
ئەمانەش توانای پەرچ دانەوەی هەموو پیلانەکانی دوژمنی هەیە کەدژی عێراق و نەتەوەی عەرەبی دەیکەنو توانای سەرکەوتن دوای سەرکەوتنمان هەیە، هەمووش بەتواناو هێزی سەرۆکی خۆشەویستمان کاك ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت وەدیهات .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٩٠. لاپەڕەی دواوە . ژمارە ١١٩٥.

## پیشەسازی سەربازی بەشێکە لەسەرکەوتنی مەزنی عێراق

جەمال عەبدلا

جەکی عێراقیش بەڵگە نامەیەکی دیارو گرنگە بۆ دەسەلاّتی پۆلاّینی عێراقیەکان‌و هەموو بیروباوەڕێکی کۆنی لەرەگ‌و ریشەوە دەرهێناو کەسەبارەت بەمافەکانی گەلانی جیهانی سێهەم دەرکرابوو، ئاستێکی بەرزو گونجاویان بۆ ولاّتەکەیان دروست کردو بەزانست‌و بیرو هۆشمەندی توانیان لەم سنورەش بدەن‌و هەموو جۆرە چەك‌و تەقەمەنیەکی پێشکەوتوو دروست بکەن بۆ گەلیٚ کە بەرگری لەخاك‌و بوونی نەتەوەکەی بکات، تێکۆشەرە پاڵەوانەکەی پیشەسازی سەربازی لە وشەکانیدا هەمیشە ئەوە دوپات دەکەنەوە کەسنوری پێشکەوتن لەبەردەمیاندا کرایەوەو بەگوێرەی هیواو خواستی دەسەلاّتی گەلی عێراق کەپێشەوای مێژووی ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت دروستی کردوە خستیەتە قەوارەی خواست‌و ئاواتەکانی گەلی عێراقەوە گەیشتە ئاستی ولاّتە پێشکەوتوەکانی جیهان .

بۆموشەکی دابران، بۆ قەزیفەی پێشکەوتوو، بۆنەو تۆپانەی کەتا ئێستا یەکەم جارە لەجیهاندا دروست کراوە، دەسەلاّتی گەلی عێراق هیچ بوارێك دانراو بەجیٚ ناهێلیٚ لەبەردەم خۆیدا، تەنانەت ئەو چەك‌و تەقەمەنیەی بەپێشکەوتوانەش کەلەلایەن ولاّتە پێشکەوتوەکانەوە دروست کراوە سەربۆئەم گۆڕانکاریە گرنگە دادەنەوێنن .

تێبینی : دەبێت خوێنەر ئەوەبزانێت ئەم جەمال عەبدلا یە جەمال عەبدولاّی ڕاوێژکاری کاك عومەر فەتاح نیە، بەڵکو ناوەکانیان لەیەك دەچێت ، رۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ۱۹۸۹. ژمارە ۱۰۹۰، لاپەرە ۲.

## داستانی ڕزگار کردنو بنیات نان

**سەردار مستەفا**

ئەنجامی ڕزگار کردنی شاری فاو شاری خۆبەخت کردنو دەروازەی سەرکەوتنی مەزن لەجەنگێکی داستانیدا بەجێی سەرسوڕمان بوو بۆپیاوە سیاسییو سەربازیەکانی هەموو جیهان، چونکی یەکەمین هەنگاو بوو بۆ ڕزگار کردنی هەموو قولەکانی نیشتیمانیو فەرز کردنی ئاشتی بەسەر دوژمندا .

بۆیە شتێکی سروشتیو ئاساییە کەکاروباری دووبارە ئاوەدان کردنەوە و بنیات نانی ئەم شارە بەم ڕادەیە پێشکەوتوە بێن بگونجێ لەگەڵ نرخی مێژوویی کاری پاڵەوانیەتی جێ بەجێ کراو لەم ڕۆژگارەدا .

سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت گرنگی نیشتیمانی ئەم هەڵمەتە گەورەیە بۆدوبارە ئاوەدان کردنەوەی شاری فاو دیاری کردو بەوەی کەڕزگار کردنی شاری فاو شاری خۆبەخت کردنو دەروازەی سەرکەوتن مەزن نیشانەیەکە ڕاستی تواناێ عەرەب لەقۆناغەکانی ڕزگارکردنو بنیات ناندا دیاری دەکات .

بۆیە و لەبەرگرنگی شەڕی فاو و لەبەر گرنگی ڕزگار کردنی ئەم شارە سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت ناوی ئەم شارەی نا شاری خۆبەخت کردن و دەروازەی سەرکەوتنی مەزن .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١٠٩٢، لاپەرە ٢.

## شۆڕشی ١٧–٣٠ی تەمموز

**صەباح موسی عەلی**

گەلی عێراق چەند سەدەیەك دوچاری نەبوون و کەساسی و بێ دەرامەتی بوبو، گەلی عێراق هیچ پێداویستیەکی ژیانی لەئارادانەبوو تەنانەت پاروە نانێکی بەئیسراحەت نەدەخوارد کاربەدەستان و دەسەلات دارانی ئەوسای عێراق ئاوڕیان لەماف و بەرژەوەندی گەلی عێراق نەئەداوەو هەرخەمی سك تێرکردن و گیرفان پڕکردن و قازانج و بەرژەوەندی ئاغاکانیان بوون، کە شۆڕشی گەل شۆڕشی ١٧– ٣٠ی گەلاوێژ بەسەرکردایەتی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب هاتە کایەوە.
سەرکردایەتی پارتی و شۆڕشی و لەسەرویانەوە بەرێز سەرەکی فەرماندە ( سەدام حسین )کەوتە خەم خواردن و بەتەنگەوە هاتنی ماف و بەرژەوەندی گەلی عیراق ئەوەبوو شۆڕشی ١٧–٣٠ی گەلاوێژ پاش ئەوەی بەردی بناغەی قایم کرد و هەموو هێزە کۆنەپەرستەکانی لەناوخۆی وڵات لەناوبردو دەستی بەبەر هێنانی ژیانێکی ئاسودەو کامەران بۆ رۆڵەکانی گەلمان.
چونکە سەرکردایەتی شۆرش بەهۆی ئەو ئامانجانەی پێی تێپەری و بەهۆی شارەزایی بارو زروفی گەلی عێراق هەوڵی چاککردنی ئەو بارە ناهەموارەی دەدا، ئەوەبوو یەکەم هەنگاوی ڕاگەیاندنی بەیانامەی ١١ی ئازاری مێژوویی لەساڵی ١٩٧٠ و جێ بەجێ کردنی یاسای ئۆتۆنۆمی ڕاگەیاند .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٨٩. ژمارە ١٠٩٣، لاپەرە ٢.

## تەمموزی سەرکەوتن و ئاشتی

سەعدی حسین رەشید

کۆنەپەرستانی ئێران بەهەموو شێوەیەك کۆمەکیان کردو یارمەتیان دا بۆ دەست درێژی کردنە سەر ئاوو خاکی عێراق، ئەوە بوو لە ئەنجامی ئەو جەنگە هەشت ساڵەیەدا کەئەو رژێمە بەرپای کرد دژی عێراقمان بۆ بەدی هێنانی خەون و خەیاڵی بۆگەنی خۆیان و ئیمپریالیزم و زایۆنیزم عێراق لوتیانی شکاندو سەرکەوتنێکی گەورەی بەدی هێنا و ئەویش بەرابەری و لێهاتوویی فەرماندە نمونەییەکی سەرۆك ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت .

لەم رۆژانەدا کەیادی بیستو یەکەمین شۆرش ١٧-٣٠ی تەمموز دەکەینەوە ئاهەنگی شادیو خۆش دەگێرین، لەهەمان کاتدا ئاهەنگی سەرکەوتن دەگێرین و کەتوانیمان پاش هەشت ساڵ جەنگی بەردەوام بەسەر رژێمی ئێراندا سەرکەوین و وایان لێبکەین قایل بن بەبریاری ٥٩٨ ی ئەنجومەنی ئاسایش دەوڵەتان و تەقە رابگرن .

ئێستاش ئاهەنگ گێران و شایی کردنمان لەدوو بۆنەی پیرۆز یەك دەگرنەوە یادوبیرەوەری شۆرشە مەزنەکەمان شۆرشی ١٧-٣٠ی تەمموزی ئەمرو سەرکەوتنمان و گەرانەوەی ئاشتی بۆ ولأتمان .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٨٩ . ژمارە ١٠٩٣ . لاپەرە ٢ .

## سلاو ریزو خۆشەویستی بۆ سەرۆکی فەرماندە

### ( سەدام حسین )

**نەشمیە وەندی**

لەم ڕووەوە لەئەنجامی تێروانینی زانستیانەو مرۆڤانەی پارتی سەرکردەوە، ئەبوایە بهاویشتایە کەئەمەش چارەکردنی مەسەلەی کورد بوو، بەم جۆرەش کورد بەمافە ڕەواکانی خۆی شاد بو، ئەمەش کارێکی زۆری کردە سەر یەك بونی ئیرادەی گەل‌و قوڵکردنی یەکێتی نیشتیمانی .

شۆڕش دەستی بەجێ بەجێ کردنی شۆڕشی پەرەپێدان کرد، سەدان دەسکەوتی مەزنی لەهەموو ڕووەوە بەدی هێنا، ئەم دەسکەوتە مەزنانەش بوون وایان لە لایەنەکانی ئیمپریالیزم‌و هێزی کۆنەپەرست کرد رژێمی ئێرانی هاندا جەنگ بەسەر عێراقی شۆڕش بسەپێنن‌و درێژەی پێبدات .

ئەوەبو پاش هەشت ساڵی جەنگ ڕژێمی ئێرانی بەزی‌و سەری بۆ ئیرادەی عێراق شۆڕ کرد و چاری ناچار بەئاشتی ڕازی بێت .

سلاوی ڕێزو خۆشەویستی بۆ بەرێز سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) بەبۆنەی بیرەوەری بیست‌و یەکی شۆڕشی حەفدەی سی تەمموزی پیرۆزەوە .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٨٩. ژمارە ١٠٩٤ .لاپەرە ٤.

## ئاشتی ڕاستەقینە

ڕازاو حەمد

ئەو پەیوەندیە سروشتیەی کەدەبێ نێوان ئێرانو ولأتانی عەرەب دا هەبێ پێش هەموو شتێ پێویستی بەبەردەوام بوونێکی ڕاست هەیە بۆکاروباری هێنانەدی ئاشتی نێوان عێراقو ئێران بەپێی بڕیاری ٥٩٨ و نەمانی شەڕو هۆیەکانی شەڕ.

سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت لەووتەیەکی دا دوپاتی کردەوە کەوا ئێمە ئاشتی هیواو مەبەستمانە، ئاشتی جێ بەجێ دەکرێت چونکە گەلانی ئێران زانیان کەوا لەم شەڕەدا هیچیان دەست ناکەوێ هەروەها زانیان کەئاشتی خێرو بەرەکەتی تیایە.

هەروەها سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) ووتی ئەوەی دەیەوێ تیمار بکات نابێ ڕوو بکاتە شەڕ بەڵکو دەبێ ڕوو لەئاشتی بکات، ئێستاش لایەنی ئێرانی داواکارە کەوا باش لەم بارو دۆخەی ئێستا تێبگاو سود لەم بارەیەوە وەربگرێت بۆ باش کردنی پەیوەندی دواڕۆژی خۆی لەناوچەکەداو ڕووبکاتە دابین کردنی پێداویستیەکانی گەلی ئێرانو بنیات نانی ئێران .

سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت لەدوانە بەنرخەکانی دا ووتی ئێمە لەپەیوەندیماندا لەگەڵ ئێران دەمانەوێ هەریەکەو ڕێزی دەسەلأت داریەتی دەوڵەتی تر بگرینو دەست نەخاتە نێو کاروباری ناوخۆی ئەوی ترەوە .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١٠٨٨، لاپەرە ٢.

## عێراق هەمیشە هەڵوێستێکی چەسپاوی هەیە بەرانبەر بەهێنانە دی ئاشتی

گولیزار هورمزیار

لەکاتێکا عێراق هەڵوێستی دڵسۆزانەی چەسپاوی بوە بەرانبەر بەهێنانەدی ئاشتیو هەرلەسەرەتای دەسپێکردنی جەنگەوە هەوڵو تەقەلای داوە بۆگەیشتن بەبڕیارێك بۆ ڕاگرتنی جەنگ. سەرۆکی تێکۆشەر( سەدام حسین ) لەناو مێژویەکەی دا تێیدا ڕەزامەندی دڵسۆزانەی عێراقی دووپات کردەوە بۆ دەست پێکردنی وتوویژی ڕاستەوخۆ، وەلاّم دانەوەی هەموو هەولێکی ولاّتانی بۆهێنانە دی ئاشتی جێ بەجێ کردنی بڕیاری پێنج سەدو نەوەدو هەشتی ئەنجومەنی ئاسایش دەوڵەتان کەڕژێمی ئێران هەر لەسەرەتای دەرچونیەوە بەرپەرچی دایەوە .

بەلاّم عێراق هەڵوێستی چەسپاوی دیاری کردوە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکی بەڕێگەی ئاشتی، سەرۆکی تێکۆشەر دووپاتی کردەوە کەئێمە هەرگیز چاومان نەبڕیوەتە خاکی ئێران، بەلاّم ماوەشی نادەین کەڕژێمی ئێران هەرگیز چاو ببڕێتە خاکەکەمانو بستێك لەخاکمان داگیر بکاتو بەردەوام هەوڵمان داوە بۆلێکۆڵینەوەی بارو دۆخی جەنگ .

سەرۆك ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت لەزۆر لەو بۆنانەدا دووپاتی کردەوە هەرلەسەرەتایی دوژمن کاری ئێران بۆسەر خاکەکەمان ............تادوای

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٩ ، ژمارە ١٠٤٥، لاپەرە ٢.

## یادی لەدایك بوونی سەركردەی قارەمان

شیرین عەباس

لەدایك بوونی سەرکردەی قارەمان ( سەدام حسین )بەلەدایك بوونی مێژویەکی نوێی عێراق دەژمێرێت، هەرلەو کاتەوە هەستی پەروەرو پشتی خۆی کرد هەستی کرد ئەم ولاتە پێویستی بەرۆڵەیەکی بەجەرگو بەوەفاو چاو نەترس هەیە بۆ ڕزگار کردنی ولات لەزولمو زۆرداری .

بەلێ لەناوەڕاستی ساڵەکانی پەنجادا ئەم خەونە هاتەدی، سەرکردەی دڵسۆزمان هەمیشە خەونی بەوەوە دەبینی کەبچێتە ڕیزی شۆڕشگێرانەوە، شۆڕشیش بەگەرمیەوە پێشوازی لێکردو گرتیە ئامێزیەوە بەبۆنەی یادی لەدایك بوونی سەرۆکی قارەمانەوە ( سەدام حسین ) پیرۆزبای لەخۆمان دەکەینو داوای تەمەن درێژی بۆ سەرکردەی خۆشەویستمان دەخوازین .

گشت خۆشەویستیەك بۆ قارەمان ( سەدام حسین )ی ئاشتی خوازو ڕابەر و مامۆستاو باوکی گەل . بەشێوەیەك نمونەی دیارە کەببێتە هۆی ڕزگار کردنی ئەم گەلە .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ۱۹۸۹، ژمارە ۱۰۷۲ ، لاپەرە ۲.

## چیرۆك

# لەپێشدا نیشتیمان

**کەریم سەردار**

ئەحمەد شەهید کرا، پێش چاولێك نانی نامەکەی دایکی بەدەستەوەبوو، ئەم وتانەش لەسەر دەمی بوون، دایکم ئاگادار بکەنەوە من لەگۆڕەپانی جەنگدا کوژرام. سنگم بەرانبەر دوژمنان بوو، نەترسنۆکیش بووم نەبەزیوو .

سەرکردەی هێزەکە چەمایەوەو تەرمەکەی ئەحمەدی لەنێو چاوانیدا ماچ کرد، فەرمانی دا چەن وێنەیەك لەنامەکەی دایکی ئەحمەد دەربهێنێن و بخرێنە چوار چێوەوە، وێنەیەکیشیان پێشکەش بەفەرماندەی قادسیەی سەرکەوتومان کاکە ( سەدام حسین ) بکرێ، وێنەیەکیش لەگەڵ تەرمی شەهیدا بێت کەبەیداخی عێراقیەوە پێچرابێتەوە . وێنەیەکیش لەو نامەیە بنێرێتەوە بۆدایکی ئەحمەد، چرایەکە رێگای جوان مەردانە رێگای مەردانە رونـاك دەکاتەوە، هەزاران ستایش بۆتۆو بۆکورە قارەمانەکەت، ڕاستە بەچکە شێر هەر لە دایکە شێر دەبێت .

ئەحمەدی سەربازی ئازاو دلێرمان یەکێك بوو لەشەهیدەکانی ئەو شەرە، تادواهەناسەی لەریزی پێشەوە دا جەنگا بەبۆنەی ئەو هاورێکانیەوە سوپای ئێرانی چەپەڵ نائومێد بوو .

نەیتوانی بێتە خاکی عێراقەوە، ئەو خاکەپیرۆزە بەپاکی و بێگەردی مایەوە، دوژمن نەیتوانی گلاوی بکات .

تێبینی : رۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١٠٧٣، لاپەرە ٧.

## ئەستێرەیەکی پڕشنگدار داچۆڕا
## بەڵام ناکوژێتەوە

**عەتا خالید نەقشبەندی**

ئێوارەی هەینی ڕابردوو دواڕۆژی مانگی ڕەمەزان ، گێژەڵۆکەی ئەجەل هاتو شۆرەسواریکی قادسیەی دووەمو ئەستێرەیەکی پرشنگداری لەئاسمانی عێراق و نەتەوە دا چۆراند ، ئەوەبوو بەڕێز سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) لەڕاگەیاندنی ئەم هەواڵە جەرگ بڕەدا فەرمووی، ئەی گەلی عێراقی سەربەرز، ئەی پیاوە دڵسۆزەکان، لەهێزە چەکدارە پاڵەوانەکانمان .

بەم چەشنە سەرۆکی فەرماندە مهیب ڕوکن ( سەدام حسین ) هەواڵی کۆچ کردنی خوالێخۆشبوی ڕاگەیاند، کەبە چ کۆچ کردنی غەمو پەژارەی گەورەی خستە دڵی هەموو عێراقیەکانەوە .

بەم چەشنە ئەستێرەیەکی پرشنگدار لەئاسمانی بێ گەردیٚ عێراقیەکان داچۆڕاو چارەنووسی دیارترین سەرکردەی قادسیەو بەرزترین ئاڵاو شمشێرێك کەدژواریەکان کولیان نەرکدو ئاکارو واتایەکی بێ وێنەی لەناودا .

هەمووان پەژارەی ئەوەیان خوارد کەلەدەستدانی ئەو خوالێخۆشبوە ئەوە دەگەیەنێت کەئەو بیرەوباوەڕەی لەپێناویدا تێکۆشا خۆی لەپێناویدا بەخشی واتە عەدنان خیراللە.

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١٠٧٤، لاپەرە ٣.

## سەرکەوتن و ڕزگار کردن لەکارەکانی

**((توکلنا علی الله الاولی ))**

**ڕێبوار عومەر**

ئـەم سـەرکەوتنانەش وەنـەبێ لـەخۆوە هـاتبن، بـەڵکو بەنەخـشە دانـانو بەڕێوەبەردنو سەرپەرشتی کردنی تایبەتی سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) بوو خوابیپارێزێت کە جەنگاوەری پاسـەوانی کۆمـاری و فەیلـەقی سـێیەم بەئـەنجامیان گەیاند هەروەکو بەیانامەی سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکان ئەم بەتەواوەتی ڕونکردەوە.

سەرکردایەتیە بێ وێنەکەی سەرۆکی فەرمانـدە تێکۆشـەر ( سـەدام حـسین ) بـۆ هـەموو کارەکـانی ڕەزامەنـدی پـیرۆزو پەنـەمای بەخوابەسـتی یەکـەم بنـەرەتی سەرکەوتنەکان بوو کەخۆی نەخشەی بۆ دادەنـانو بـەڕێوەی دەبـردن و لەنزیکـەوە سەر پەرشتی کارە جەنگەکانی دەکرد .

ڕۆڵە مەردەکانی عێـراقیش بـەگیانو بـەدڵ ئـەنجامیان دەداو سـەرکەوتن لـەدوای سەرکەوتن نەی هێشت دوژمنی داگیرکەر بەئاسانی بەسەر خاکماندا ڕابوێرێت ،

هەرئەم سەرکەوتنە مەزنەیە یەك لەدوای یەکەکان بوون کەوای لـەدوژمنی ڕەگـەز پەرستی ئێران کرد بەبڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش قایل بێت .

ئـەم جەنگـە پـیرۆزەش جـەنگی ( قادسـیەی سـەدام ) بەسـەرکەوتنو نـەمری بـۆ عێراقی لوتکە تۆمار بکرێت .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١٠٧٨، لاپەرە ٢.

## ڕێبازی ئاشتی خوازانەی عێراق

ئازاد عبدلواحید

عێراقیش هەرگیز نیازو ئامانجی شەڕو کوشتارو خوێن ڕشتن نەبوەو نەیویستوە بە جەنگ چارەسەری گیرو گرفتەکان بکات، بۆیە لەڕۆژانی سەرەتای جەنگەوە بەزمانی سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین ) و لەوپەری هێزو دەسەلاتەوە دەنگی ئاشتی خوازانەی خۆی بەرز کردەوە .

حەزی بەوە کرد لەسەر خوانی ئاشتی دابنیشێو چارەسەری مەسەلەکان بکات، ئەوەبوو هەموو ئاشتی خوازیو خێر خواهێك لەئاستی دەوڵەتان بوویێ یان لەئاستی تاکە کەسی پیرۆزبای ئەو هەنگاوەیان کرد کەسەرۆکی فەرماندە نای بۆ مۆرکردنی ڕێکەوتنامەی ئاشتی کەمافی هەموو لایەك بپارێزێت .

بەلام چ دەکەی لەگەلٚ عەقلی شەڕ خوازانەی کۆنەپەرستان کەحەز بەئاشتیو ئاسایش ناکەنو ناتوانن بوونی خۆیان بسەلمێنن بەبێ شەڕو خوێن ڕشتن، خۆنەوانە پشتیان بەڕۆلەکانی گەلەکەمان نەئێشاوە بەکوشت دانی کوڕی خەلکی بەوان چی.

ولاتی عێراقیش قەت ڕۆژێ لەڕۆژان خۆی بەشەڕ فرۆش نەزانیوەو دەنگی لەئاستی ئاشتیو دابین کردنی هەلو مەرجەکانی نزم نەبوە، هەروەك چۆن لەهێرشو پەلاماری دڕندانەی هیچ لایەکیش خۆی بەدەستە پاچە نەزانیوە. هەموو کەسیش دەزانێت عێراق لەخاكو ولاتەکەی خۆیدا خەریکی پەرەپێدانو ئاوەدان کردنەوەبوە تا بەکاروانی گەلەپێشکەوتوەکان بگات .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، سالی ١٩٨٩، ژمارە ١١٠٨، لاپەرە ٨.

## پیشه سازییه سەربازیەکان و دەوری گرنگی لە پێشکەوتنی عێراقی نوێ دا

**دلاوەر سالح**

تێکۆشەر پاڵەوانەکانی پیشەسازی بەهەموو توانایانەوە بەردەوامن لەسەر بەرەو پێشەوە چوونی کارەمەزنەکانیان، بۆ هێنانەدی خواستو ئاواتەکانی سەرۆکی ڕابەر ( سەدام حسێن ) خوابیپارێزێو خواستو ئاواتەکانی گەلی عێراق کەتەنها خواستی سەرۆکیش بەوەوە نەوەستاوە کەکار بکەنو بۆهێنانی بەرهەمی پێشکەوتوو .
بەڵکو پێویستە ئەم کارانەشیان بەکەمترین مادە ئەنجام بدەن، تالەئاستی پیشەسازی جیهان پێشکەونو لابدەن، هەروەها تێکۆشەرە پاڵەوانەکانی پیشەسازی بەم ئاستەش قایل نینو چونکە لەئاستی ئەو کارانەدا یەکە وڵاتە تێکۆشەرە پاڵەوانەکانی پیشەسازی لەبواری پێشکەوتنو ئەو وڵاتانەدا ئەمڕۆش لەعێراقدا پیشەسازی سەربازی ئەم ئەرکەی خستۆتە سەرشانی خۆی و بەم کارە گرنگە هەستاوە بەڵام لە تاقی کردنەوەکانی دیکەی جیهان بەوە جیادەکرێتەوە کەئەم بەگوێرەی کات ڕەفتار دەکات .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١١٣٢، لاپەرە ٢.

## بەیەك دەنگ بەڵێ........ بەڵێ

## بۆ سەرۆك ( سەدام حسین )

**مەغدید سۆران**

کاتێ عێراقیەکان یادی بڕواداران بەسەرەکی فەرماندە ( سەدام حسین ) دەکەنەوە یادی ئەو ڕۆژە مەزنە دەکەنەوە کەگەلو سەرکردە بڕیاری خۆلێك بەستنەوە یەك چارەنووسیان دا لەگەڵ یەکتری، بۆئەوەی بەردەوام بن لەکاردانی پڕلە خەباتی خۆیان لەپێناوی سەربەرزیو پێشکەوتنو شکۆمەندی عێراقی مەزن .

کە لە ئەنجامی تاقی کردنەوەیەکی دورو درێژ ( سەدام حسین )ی هەڵبژارد بۆئەوەی مەشخەڵی خەباتی عێراقیەکان هەلگرێو بێ بەرانبەر چونکە لەبری گەورەی سەرۆكو لەبیروباوەڕی ڕەسەنی نیشتیمان پەروەری و نەتەوایەتی ( سەدام حسین ) گەشیتبوو، کەوەك تاقە شۆڕەسوارێکی بەجەرگ توانای ئەوەی هەبێت بەرگری لەنیشتیمان بکاتو ئاواتی گەل بەدی بهێنێت .

لەلایەکی ترەوە ئەوەی کە ( سەدام حسین )ی گەیاندە لوتکەی نەمریو شکۆمەندی سەرکەوتنی بوو لەجەنگی ( قادسیەی سەدام )دا وەك سەرکردەیەکی سەربازی بەتوانا لەبەرگری کردن لەنیشتیمانەکەی لەکاتی خۆیدا بەرپەرچ دانەوە دوژمنو بەدی هێنانی سەرکەوتنو هەڵسوڕاندنی جەنگ بەتەکنیکێکی تازەی جەنگ.

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١١٢٦، لاپەرە ٧.

## بهەلکەفتنا رۆژا باوەریێ کرنێ

## ئەی سەرکردە

**قاسم ئەحمەد نوح**

دوژمن بەسەریێ رووینێ
بەس وێرانکە ڤیێ هێلینێ
د گەل دوژمنی ئەم بێت تیژین
خوینێ لجەرگیێ وان دیێ رێژین
ب توپوتفەنگا دیێ واکوژین
ئەم عێراقی نە جەلەنگ بازین
لناڤا چیا سەرفرازین
دگەل دوژمنا ئەم شەرخازین
ئەی ولات ئەڤینا مەزن
شەیدابیێت تەهەرێت بەزن
خەملا تە هر مێرگ و زەرن
خەما نەخوا دایکا مەزن

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١١٢٦، لاپەرە ١٢.

## کەسینە دەبێتە قەڵا

## پێشکەشە بەشەهیدانی ( قادسیەی سەدام )

**عبدلخالق سەرسام**

ئەی شەهیدی سەربەستی من
کەزستان دێت گرمەی گەواڵەو بروسکی
دەنگی تۆپو تفەنگی تۆم
دێنێتەوە یاد .
تۆبە خۆتو جلکی خاکی خوێنتەوە
گوللەکانت ئەقۆزنەوە
ئەی شەهیدی سەربەستی من
کەئاسمانیش ساماڵ ئەبێ
چاوەکانی ساماڵی تۆ
ئەبنە شیعرو هەڵبەستی من
کەپایز دێو گەڵای داری
لەلق‌و پۆپی ئەباری
تۆ لەبیریو دێیتەوە
کەچۆن گەڵای سەوزە جوانی
باخی ژینی خۆت دەوەراند
تاکو باخی چڕی وڵات ............. تادوای

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٤، ژمارە ٧٦٨، لاپەرە ٥.

پێشکەشە :

**بەیەکەم دڵۆپە خوێنی کە لەسەرەتای کاروانی**

**جەنگی ( قادسیەی سەدام )ڕژا**

پێشکەشە :

**بەو شەهیدەی کەبە هەموو هیواو ئامانجێکەوە**

**خۆی بەخشی بۆگەل‌و نیشتیمان .**

**تەحسین مەولود**

دەنگێ دێت‌و
هاوار ئەکا
بانگەوازی پازدەملیۆن مرۆڤ دەکا
دەنگێ دێت‌و
دەشت‌و چیاو ڕوبارو ئاو
کڕنوشی ئەمری بۆدەبا
داوای کوشتن‌و بڕین‌و داوای شەهیدتان لێدەکا
دەخێراکەن
ئەو ئەژدیها بەتەمایە ئاڵای وڵاتان لێ لێژکا
ئاو لەسەرچاوە لیخنکا
دەخێراکەن .

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری ، ساڵی ١٩٨٤، ژمارە ٧٦٧،لاپەرە ٥.

## ( سەدام )پێشەوامانە

**حەمرین**

( سەدام ) پێشەوای سەرکەوتن
گەل بەرەو ئاواتی بردن
شۆڕەسواری بەرەی مەیدان
چڵی چاوی دوژمنان
( سەدام )مامۆستای هەمووان
بەدی هێنەری هیوامان
رۆڵەی بەرجەرگی نەتەوە
شادی هات بەهاتنەوە
( سەدام ) هاوڕێو سەرکردەمان
زیندو کەرەوەی مێژوومان
جڵەو کێشی قەیری کاروان
دڵی پڕ خۆشەویستیمان
( سەدام )زانای چەرخی سەدەی بیستەم
ڕزگار کەرمان لەدەست ستەم
( سەدام ) ناوت وەك چرایە
خاوەنی بیروبڕوایە

تێبینی : ڕۆژنامەی هاوکاری، ساڵی ١٩٨٨، ژمارە ١٠٠١، لاپەرە ٧.

## بیرەوەری هەشتی شوبات

**ئەحمەد محەمەد عەنایەت**

بەبۆنەی بیرەوەری هەشتی شوباتی ئەم ساڵ کەیادی ڕۆژێکی پیرۆزە لەمێژووی گەلی عێراقی خۆشەویستماندا بوکی شۆڕشەکان، کەبویە هۆی تەواو کردنی هەموو مافێکی گەلی عێراق بە کوردو عەرەبەوە، بەناوی لقی پێنجی سلێمانی پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان پیرۆزبای خۆمان ئاراستەی هەڤاڵی تێکۆشەرو سەرکردەی مەزن و شۆڕەسواری گەلی عێراق ( سەدام حسین ) دەکەین .

پەیمان ئەدەین هەمووکات شمشێربین بەدەس سەرکردایەتیەوە بۆ برینی دەستی ئەوانەی کەبیانەوێت لەخەویشدا چاو ببڕنە عێراقی شۆڕش، وەپیرۆزبایی لەیادی دامەزراندنی سوپای میللی ئەکەین . سوپای دووەمی عێراق . پارتەکەمان پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان لەبەر پیرۆزیی و لەخۆبوردنی ئەم سوپامەزنە وەك ئەرك بەشداری جەنگمان کردوە .

تائێستا شەش بەش بەشداربوین و بەشی حەوت لەفێرگەن، سڵاو لەسەرکردەی پاڵەوان ( سەدام حسین )، لەبیرەوەری هەشتی شوباتدا نەمری و سەربەرزی بۆشەهیدانمان، سەرشۆڕی و مردن بۆ خومەینیە پەرستەکان .

تێبینی : ئەم بەڕێزە لەکاتی بڵاوبونەوەی ناوەکەی لەڕۆژنامەی هاوڵاتی گلەی لێکردم کە ئەو قەڵ‌ّمی بەعس نەبوە بەڵکو بەعسەیەکی دڵسۆزبوە بۆیە نابێت فایلی هەبێت، بەڵکو ئەو فایلی بۆخەڵك کردوە، ڕۆژنامەی هاوکاری . ساڵی ١٩٨٥، ژمارە ٧٧٥، لاپەرە ٥.

## ریپۆرتاژ

## هاوڕێ حەسەن عەلی ئەندامی سەرکردایەتی .

**محەمەد مەلا ئەسعەد**

هاوڕێ حەسەن عەلی ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی و ڕازگری نهێنی نووسینگەی ڕێکخستنی باکوری پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست، بەحەقیقەت مامۆستایەکی دڵسۆزو شیاو چالاکی گەلەکەمانەو هەمیشە لەنزیکەوە لەگەڵ کۆمەلانی خەڵك تێکەلاو دەبێو سلاو خۆشەویستی سەرۆکی مەزن و وەفاداری کاك ( سەدام حسین )خوابیپارێزێت دەگەیەنێتە خەلکی کوردستان .

هەمیشە لەکەمو کوریەکانیان دەکۆڵێتەوەو چارەسەریان بۆدادەنێت، ئامۆژگاری بەنرخیشیان پێشکەش دەکات، لەزۆربەی کۆڕە جەماوەریەکاندا لێپرسراو کاربەدەستانی ئاگادار کردۆتەوە کەدەبێ لەوەش زیاتر خزمەت بکەن کەئێستا هەیە

واتە دەبێت هەمیشە بەهەموو لایەکەوە هەوڵ بدەین ڕۆژ بەڕۆژ بەرهەممان زیاتر بکەین لەسەردەمی ئاشتیو بیناکردنو لەسایەی باوکی فەرماندە سەرۆکی هێژا کاك ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت .

ئێمەش بۆئەوەی زیاتر وتەبەنرخەکانی بەڕێز بگەیەنینە لای کۆمەلانی خەڵك لەنزیکەوە گوێمان بۆڕاگرت تابزانین چیمان پێدەڵێت .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١ لاپەرە ٣.

## ( سەدام حسین )پیاوی بنیاتنان و ئاشتیشە

**هوشیار ئەحمەد حسین**

وەلەشازدەی حوزەیرانی ڕابردوو دا بەرێز خالید سەعید سکرتێری گشتی کۆمەڵەی خێرخوازی ئیسلامی خەلاّتی ئاشتی پێشکەش بە سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین )خوا بیپارێزێت کرد، بەناوی موسڵمانانی بەریتانیاوە کەلەباتی بەڕێزی سەفیری عێراق لەبەریتانیا ئاهەنگێك دا لەمزگەوتی سەرۆك ( سەدام حسین) لەبرنگهام وەری گرت .

بەبۆنەی ئەو دەورە دیارەوەی کەلەئاشتی بەینی عێراق و ئێراندا دیویەتی، لەدووی تەمموزی ئەم ساڵدابەرێز سایل سینگ سەرۆکی وەفدی دەزگای یەکێتی ئاشتی جیهانی و لەیەك گەیشتنی نێودەوڵەتان خەلاّتی دەزگای پێشکەش بە سەرۆکی سەرکەوت و ئاشتی( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت کرد بۆ ئەو دەورەبەنرخەی هەی بوە لەئاشتی نێوان عێراق و ئێران دا هەروەها ئەو دەورەی دەیبینێ لەتێکۆشانی هەوڵ و تەقەلای جێ بەجێ کردنی نیزامی ولاّتانی نوێ لەسەر بنەرەتی دادپەروەری و یەکسانی و سەربەستی هەلۆیستی ئەو ڕێکخراو دەزگا جیهانیانە لەگرنگی پێدان بۆدەوری مێژووی سەرۆکی سەرکەوتن و ئاشتی ( سەدام حسین )خوابیپارێزێت .

سەرۆکی تێکۆشەر (سەدام حسین ) خوابیپارێزێت بەتاقی کردنەوەی توانا و هێزیەوە دەری خست کەپیاوی بنیات نان و ئاشتییە کەبەخۆراگرتن و زیرەکی و وریایی دوژمنکاری ڕەگەز پەرستان بەربەست کردو سەرکەوتنی بەدەس هێنا .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ٣، لاپەرە ٢.

## سەرکردەی مەزن

## بۆ باوکی دڵسۆزمان (سەدام حسین )

**ێبوار توفیق**

ئەی پاڵەوانی سەرکردە
هەوڵت بەدەستو بردە
ڕوناکی بۆئەم دووچاوە
ناوت لەدڵ نووسراوە
رابەری گەلو هۆزی
سەرکردەی زۆر دڵسۆزی
تۆنیشانەی سەربەرزیت
قارەمانی ئابەرزیت
ئەی پاڵەوانی خەبات
ئەی ئاسۆی بەرزی ولات
ئەی ئاشتیو پایەداری
مەردی گەلو وەفاداری
باوکو براو پێشەوای
تۆبۆمان هەموو دونیای
ڕۆڵەی مەردی چاومانی
ڕوناکی نیشتیمانی

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ٣، لاپەرە ٧.

## با ئاسۆ درِ بەشەوە زەنگ بدا

رەشید ئەنوەر بێتواتە

ئەمەنێکە بیر لەوە دەکەمەوە ئاخۆ کەی بێ ڕۆژنامە بەزامنی زکماك دەگاتە هەموو کونج و کەلەبەرێك و تیشکی گەشی پێڵوی چاوانی پێ دەپشکوێت، بائەمەش فەرامۆش نەکەین لەسایەی پارتی و سەرۆکی مەزن ( سەدام حسین )خوابیپارێزێ دەزگای ڕۆشنبیری و لاوان لایەنەکانی تری ئەم مەبەستە بێ هەدادان و دریغیان نەکردوە بەنیازی برەودان بە گەشەکردن و نەشو نماکردنی باری ڕۆشنبیری لە کوردستان و گەلێ قەڵەمی ڕەنگینی بەتوانا لەم قەراخەدا فرچکیان بەخشیوە بەکۆرپەو خوێنەرانی کورد .

ئەوا ئێستاش خەونێکی تر لەدایك بوو ئاسۆ هات و ئاوێزانی باڵای زراڤی ماکۆك بوو بەهیوام ببێتە پێشەنگی کاروانی تەبایی و لوتکە بەرەو قۆناخ ببڕێت .

خۆزگاش دەخوازم شۆرەسوارانی گورەپانی ئاسۆ ئەسپی خۆیان تیالنگ دەن و خاوەن قەڵەمە داهێنەرەکان و تەوژی هزرەکان مۆرکی رەسەنی ببەخشن، تکام وایە بێ ئاوردانەوەو هەنگاوی تیژ بنێن .

بایەخ بە پاراوی و ڕێزمان و فەرهەنگی سروشتی بدەن، تاتەوقی نەخوێندەواری لەئەستۆی لاتی دارمێ .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ . ساڵی ١٩٨٩. ژمارە ٧. لاپەرە ٥.

# هیوای منداڵانی کورد

رەزا شوان

بەڵام ئەو مەرامانەی کەتا ئەمڕۆش خۆزگەی هێنانە دی دەخوازین، دەرچونی گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتیە بەزمانی کوردی بۆمنداڵانی کورد، هەروەك‌و سەرکردەی سەرکەوتن‌و ئاشتی ( سەدام حسین) خوابیپارێزیت دەڵێ : ڕەواڵەتی دوارۆژ لەمنداڵەوە دەست پێدەکا، چەندمانگێك لەمەو پێش بیستمان کەدەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی نیازیان وایە بەم خزمەتە پیرۆزە هەستن‌وگۆڤارێك بۆمنداڵان دەرکەن .

بەڵام وادیارە ئەمجارەش هەرقسەیەك بوو کراو جێبەجێ نەکرا، هیوادارین کاربەدەستانی دڵسۆزوخەمخواری نەوەی دوارۆژی گەلەکەمان هەوڵێ بدەن بۆ هێنانە دی ئەم خۆزگەو هیوایەی منداڵان .

هەردەمیش گەشبینین و دڵنیاین کەلەژێر ئالآی سەرکردەی مەزن ( سەدام حسین ) دا هەموو مەرام‌و خواستێکی بەجێی گەلەکەمان دێتە دی، لەسایەی شۆڕشی ١٧-٣٠ی تەمموزی گەلێ هیواو مەرامی ئەدەبی‌و رۆشنبیری گەلەکەمان هاتنە دی .

وەکو دامەزراندنی یەکیەتی نووسەرانی کورد، کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی، کۆڕی زانیاری کوردی،

پەیمانگای هونەرەجوانەکان لەسلێمانی، دامەزراندنی دەزگای رۆشنبیری و بلاّو کردنەوەی کوردی. دەست گرتنی نووسەرانی کورد بۆ چاپ کردنی نووسینەکانیان، دەرچونی گۆڤاری بەیان‌و رۆشنبیری نوێ‌و ڕۆژی کوردستان‌و تەندروستی‌و کۆمەڵ‌و ڕەنگین‌و ئۆتۆنۆمی‌و ڕۆژی کوردستان‌و هاوکاری‌و پاشکۆی عێراق‌و ئاسۆو برافۆ .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١١، لاپەرە ٨.

# هەڵوێستێك كەجێی شانازیمە

**غەفورساڵح**

هیچ كاتێ بەبێ دڵی خۆم دەستم نەداوەتە قەڵەم، ئەو بابەتەش كەنووسیومە قەناعەتێكی تەواوم پێی هەبووە، نەكەس هانی داوم، نەكەسیش چوەتە ژێر كلێشەمەوە كەشتێك بنووسم، ئەو جەنگە سەختەی كەگەلی عێراق بۆماوەی هەشت ساڵ دووچاری بوبو نەدەبوو لەمێژووی ئەدەبی ئەم وڵاتە جێگای خاڵی ببوایە .

منیش وەكو مرۆڤێكو ئەشكەنجە كێشانم بۆئەو بارە تووشەی كەگەلی عێراق تێیكەوتوە بەدەستی رژێمی ئێرانەوە، بەڵام گەلی عێراقیش مەردانە بەسەركردایەتی سەرەكی فەرماندە ( سەدام حسین ) لوتیانیان شكاند .

بۆیە هەستم كرد نابێ بێدەنگ بم، بۆیە بەچیرۆكی درێژی هونەری بەشداری خۆم دەربڕیو واش بزانم چیرۆكێكی نەمر دەمێنێتەوە وەكو چیرۆكی جەنگ كەساڵی ١٩٨٣نووسیم، بەڵام بەهەڵە ناوی وترا رۆمان، هەروەها لەو فەرمانە ئیداریەی كەبۆی دەرچوبو بەچیرۆكی درێژ لەقەڵەم دراو لەپێشبركێی دەزگای رۆشنبیری و بڵاو كردنەوەی كوردی خەڵاتی یەكەمی وەرگرت، من تاكە چیرۆك نووسی دیاربوم كەلەو پێش بركێیەدا بەبێ هیچ سڵ كردنەوەیەك بەشداریم كرد، وەكو بابەتێكی هونەریش زۆر دڵم پێی خۆش بوو، ئەوەبو مامۆستا عبدالستار كردیە عەرەبی و هەرچاوەرێی ئەوەبو كەدەقە كوردیەكەی بكەوێتە بازارەوە، بەڵام هیچ دەنگوباسێكی نەبو تاساڵی ١٩٨٨كەلەگەڵ سێ چیرۆكی دیكەدا بەناوی ئەدەبی جەنگەوە دەرچوو ئەو وەرگێڕانەش بەئاگاداری خۆم بوو ئێستاش حەزدەكەم بڵاو ببێتەوە .

تێبینی : رۆژنامەی ئاسۆ ، ساڵی ١٩٨٩، ژمارە ١٦، دواڵاپەڕە .

## لەگەڵ وجودی سەرۆك (سەدام حسین )

**شێخ محەمەد قەرەداغی**

لـەم ڕووەوە ولاتـە خۆشەویـستەکەمان بەڕابـەری سـەرکردەی مـەزنمان ( سـەدام حسین ) چەندان هەنگاوی پیرۆزی ناوەو دیارەکانیان، کردنەوەی زانکۆی ( سەدام ) بۆزانیاری ئیسلامی، ئەمە هەنگاوێکی چاکە بـۆ بلاۆکردنـەوەی زانیـاری ئـەم ئاینـە پیرۆزەی ئاینی دینو دنیایی‌و زانیاری‌وسود گەیاندنی بەمرۆڤی فراوان‌و مەزن .

لەگەڵ وجودی سەرۆك ( سەدام حسین ) پاشەڕۆژ زۆر ڕونـاك دەبیـنم، هیـوادارم‌و دڵنیاشم وادەبیٚ ناوچەی کوردستان هێمنایەتی‌و ئاوەدانی زۆرتـر بەخۆیـەوە ببینـیٚ گەلەکەمان‌و ناوچەکەمان بەهۆی تێکدەران‌و ئەوانەی بونەتە داردەستی بێگانـە زۆر ئازارو ئەشکەنجەی دی، مافی ئـەوەی هەیـە بـەدوای سـەرکەوتن‌و ڕۆژگـاری حـەق‌و بـاوەڕی یـەکێتی گـەلی عێـراق لەسـایەی سـەرکردەی ڕەمـزو گەورەمانـدا ( سـەدام حسین) هێمنی و ئاوەدانی پێشکەوتن بەخۆیەوە ببینیٚ .

بەتەنگـەوە هـاتنی خواسـت‌و داوای ڕەوای خـەڵك دەلاقـە بـەڕووی هـەموو ئـەو ناحەزانەدا دادەخـریٚ کەنایەنـەویٚ ئـەم گەلـە بەئاسـودەیی بـژی، ئومێـدی زۆرمـان بەسـەرکردە ( سـەدام حـسین )ی مـەزن لەسـایەی ئـەودا نەبوایـە عێراقیـەکان بەعەرەب‌و کوردەوە ئەم ئاسودەیی‌و ئومێدە فراوانەیان بۆ نەدەهاتە دی .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ ، ساڵی ١٩٨٩. ژمارە ٢٢، لاپەرە ٣.

## شەهید

**خالید عەزیز کەریم**

شەهید شاگوڵێکی سووروو گەشە کەبەخوێنی خاوێن پاراو کراوەو باخچەی مرۆڤایەتی پێ ڕازانەوە ، شەهید ئەو هەتاوە بەشەوق و تینەیە کەلەسەر سینگی پانی ڕۆژگاردا بەشانازیەوە خۆی دەنوێنیٚو بەشەبەقی بێوێنەی خۆی قوژبنەتاریکەکان ڕوناك دەکاتەوە .

بەخوێنی سوریان نوسیان سەرکەوتن بۆئێمەو مردن بۆدوژمنان .هەمووساڵێك گەلی عێراق بەرێزەوە یادی ئەم ڕۆژە پیرۆزە دەکەنەوە، کەڕۆژی شەهیدانی قادسیەی پیرۆزی ( سەدام )ە چەپکەگوڵ لەسەر پەیکەری شەهید دادەنێن .

لەم ڕۆژە پیرۆزەدا گەلی عێراق بەگشتی پەیمانی وەفاداری بۆ سەرەکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت نوێ دەکەنەوە، گەلی عێراق لەرابردو و ئەمرۆو بەیانیش ئازایانە بێ ترس پارێزگاری لەوڵاتەکەی کردوەو نەیهێشتوە نیشتیمانەکەی بکەوێتە ژێردەستی دوژمنانو بەهیچ جۆرێك ڕازی نەبوە کەیاری بەچارەنووسیان بکات .

کەهەمیشە ئامادەن بۆ پارێزگاری نیشتیمان .

سلاو لەبنەماڵەی شەهیدان

سلاو لەجەنگاوەرە ئازاکانمان .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ . ساڵی ١٩٨٩. ژمارە ٢٢. لاپەرە ٢.

## پێشکەشە بەقارەمانی گەل‌و نیشتیمان ( سەدام حسین )

## خۆشمان دەوێی

**محەمەد پەشێو**

خۆشمان دەوێی کاکە( سەدام )
ڕۆژهەلاتو دیجلە خۆی ڕاوەشاند
وەك ئەسپێکی باڵدار حیلاندی
خۆی گەیاندە ولآت
باسی ڕۆژەکانی خۆشەویستی خۆی
بۆکردی‌و
دەستی بۆڕاکێشای ئەملاو ئەولای ماچ کردی
جێ ماچەکە .... وەك پەلکە زێڕینە دەدرەوشایەوەو
هاواری کرد
سەری ڕێزت لەعێراقدا بلندە
وەك چیا سەرکەشەکانی کوردستان
هەرلەو شەوەدا
چاوی گولآلە سوورەکانی کوردستان
داگیرساوهاواریان کرد
کاکە ( سەدام ) خۆشمان دەوێی
هەرلەو شەوەدا تروسکایەك
بەسەر دیجلەدا هاتوچۆی دەکرد
شمشێرێکی گڕاوی بەدەستەوەبوو
فرمێسکەکانی سەلاحەدین‌و قاع قاعی دەسڕی

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ ، ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ٢٥، لاپەرە ٢.

## سەرەك ( سەدام حسين ) دەسپێشخەری بەردەوام لەپێناو ئاشتی دا

محەمەد موكری

لەیادی شەستو نۆهەمین سالّی دامەزراندنی سوپای عێراقی مەزن، سەرۆكی فەرماندە ( سەدام حسين ) لەرێی دەزگا ڕاگەیاندنەكانەوە بۆهەموو دنیایی ئاشتی خوازی سەلماند، كەتاقە ڕێگای سەرفرازی میللەتان تەنها ئاشتی یە، ئەم هەنگاوە مەزنەی عێراق ڕەنگدانەوەیەكی راستەقینەی ویستی ویژدانی سەراپای میللەتی عێراقە بۆبەرقەرار بوونی ئاشتی .

ئەم دەسپێشخەریەی سەرۆكی فەرماندە ( سەدام حسين ) هەلی بیناسازیو ئاوەدان كردنەوە دەرەخسێنێ، ئاشتی خوازێكی دروستە بۆپتەو كردنی پەیوەندی نێوان هەردوو دەوڵەتی عێراقو ئێران، ئەم هەنگاوە مەزنەش ویستە هەمیشەیەكەی عێراق دەسەلمێنێ كەهەولّی بێ وچانی بۆسەقام گیربوونی ئاشتی و ئاسایشی ناوچەكەیە، هەڵبەتە ئاشكراشە ئەم دسپێشخەریە لەناخی باوەڕ بەخۆبوون و توانای پتەوەوە سەری هەڵداوە .

نیەت سافی دەردەخات، سنووری بۆ وەزعی نەجەنگ نەئاشتی داناوە ئاشتی خوازانی دونیاو گەورە پیاوانی فكرو سیاسەت پێشوازیان لەم هەنگاوە مەزنەی عێراق كردوستایشی ئەم جورئەتەیان كرد، زیاتر لەمانگێكە دەزگا ڕاگەیاندنەكانی دەوڵەت بەردەوام باسو ستایشی ئەم هەنگاوە مەزنە دەكەنو داوا لەئێران دەكەن مل بۆ واقیعی سەردەم دانەوێنن .

گوێ بۆ ویژدانی خاوێن ڕاگرن سەرنجی حەقیقەتی خاڵەكانی ئاشتی بدات، كەعێراقی مەزن زەمینەی بۆ خۆش كردوە .

تێبینی : ئەم بەرێزە چەندین وتاری لەسەر بەعسو سەدام هەیە تەنها ئەم نمونەیەمان وەرگرتوە . ڕۆژنامەی ئاسۆ. سالّی ١٩٩٠، ژمارە ٢٨. دوالاپەرە .

## سەرکردەو جەماوەر

**خدرمحەمەد مەحمود**

سەرکردەو جەماوەر تەواوکەری یەکترین لەکاتو شوێنێکی دیاری کراوی مێژوویدا، سەرکردەی ولات کۆڵێ شانازی یەخەی میللەتەو ڕابەری بەرنامەی ئایندەوریێبازیانە، ئێمەی عێراقی ڕۆڵەی دیجلەو فورات و دارخورماو گوێزین، ڕۆڵەی ئەو باوکەین بەسۆزی بەخشندەی فێرمان دەکا. کەعێراقین، قوتابی ئەو مامۆستایەین کەدەستمان دەگرێ بەرەو ترۆپکی شارستانیەتو سەربەستی‌و دیموکراتی .

جارێکی تر سەرەکی فەرماندە ( سەدام حسین ) خوابیپارێزێت ئەلفو بێمان فێردەکاتەوە لەسەر ئیقاعی هاوچەرخیەتی‌و پێمان دەڵێ : چۆن زەمەن چریکەینەوە بۆ ئافراندنی شاکاری ژیان هەموو سیفاتێکی مرۆڤی نمونەی بونەکالآیەکی بەنرخو بەبالآی مامۆستامان ( سەدام ) براوە هەروەك چۆن بۆئێمە پێناسنامەو نان‌و ئاو ئاواش پالەوانی خەونەکانی ئێمەیە .

هەلگری بیروباوەڕی سەرەکمانین‌و شمشێری هەمیشەی دەستی پیرۆزین، ئەوا جارێکی تریش سەرەکمان سەلماندی کە عێراق هەرئەو عێراقەیە کەئەو نەخشەی بۆ کێشاوە، لەکاتی جەنگو دوای جەنگ بەبلیمەتی چارەسەری ئابوری‌و و هەموو کۆسپێك دەکات .

کەسەلمێنراوە زۆر لەمێژە بنیات نان‌و شارستانیەت دروشمی ئاشتیە، ئەوەتا جارێکی تریش لەوتارە مێژوویەکەیدا پشتگیری ئاشتی کردوو ئەو مەبەستە پیرۆزەی سەلماندکە هەموو جیهان دەستی پشتیوانیەتی بۆ هەڵوێستی عێراقی مەزنمان، هەربۆیە داوای تەمەن درێژی بۆدەکەین .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ . ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ٣٠، لاپەرە ٢.

## ئاسۆو چەند خۆزگەیەك

خالید کەریم زەنگەنە

خۆزگە دەوڵەمەندەکانی کوردستان یارمەتی ماددی ئاسۆیان دەداو سوپاس نامەو شەرەفـو ڕێزی ئاسۆیان بۆخۆیانوبۆ سامانەکەیان دەنەخشاند، خۆزگە هـەموو ئـەو هەنگاوانە ڕۆژ بەڕۆژ تەی دەکران کەدەمان گەیەنێتە ئەو مەڵبەندەی.

کەخاوەنی چاپخانەیەکی سەربەخۆی کوردیو دوابەدوای ئەویش مـژدەی یەکـەم ڕۆژنامەی ڕۆژانەی کوردیمان دەدرا بەگوێ، کۆمەلانی خـەڵکی کوردسـتان هەڵبەتـە ئەمەش دیاری سەرەکی خۆشەویستو ئەندازیاری حوکمی زاتی (سەدام حـسێن)ەو چونکە خاوەنی بیرێکی مرۆڤایەتی گەلێك مەزنەو خۆشەویستی گەلی کوردەو کوردی خۆش دەوێت .

خۆزگە سەردانی ئـەو دەزگایانـە دەکـراو کەتائێستا دورن لەدیـدەنی خوێنـەرانو کۆمەلانی خەڵكو کەمتر سەردانی ئەو دەزگایانە دەکرا کەساڵی زیـاتر لـەدەیان جـار ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکان سەردانیان کردونو دەکەن .

خۆزگە ڕۆژو مانگی کـوردی شـان بەشـانی مێـژووی کۆچـیو زاینـی لەسـەر دێـڕی یەکەم لاپەری ڕۆژنامەکە چاپ دەکرا .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ . ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ٣٤، لاپەرە ٤.

## ئاسۆی ڕۆشنبیری کوردی

ئەحمەد محەمەد ئابلاخی

لەمێژووی ئەدەبی هەموو جیهاندا مێژوو نووسانو رەخنەگرانی ئەدەبی کەدێن لەسەر دەمێکی دیاری کراو ئەکۆڵنەوە هەرلەپێناوی بەراورد کردنو ئاسان کردنی ڕێچکەی لێکۆڵینەوەیەکدا ئەو سەردەمە ئەخەنە نێوان دوو ڕووداوی دیاری کراوی ولاتەکە .

بەلام لەبیستی دووەمدا زۆرە جگە لەبلاو کراوە کوردیەکانی وەکوهاوکاریو ئاسۆو برافو پاشکۆی عێراقو گۆڤارەکانی وەك و بەیانو رۆشنبیری نویو رەنگینو تەندروستیو کۆمەلو گۆڤاری حوکمی زاتیو نووسەری کوردو ئەمانە هەموولەبیستی دووەمدا هاتوەتە کایەوە جگەلەوەش تەقینەوەو نوێ بونەوە و گاز فرێدان زۆرباری ئەدەبیو هونەریو زۆرلایەنی داهێنان کەوتوەتە نێوان ئەم دووبەروارەوە کەوتمان یانزەی ئازاری ١٩٧٠ بۆ یانزەی ئازاری ١٩٩٠ ئەمە تەنها باری سەرنجێکی سەرپێی بوو نەك لێکۆلینەوەو بەراوردێکی ورد لەنێوان ئەو دوو بیست ساڵەدا .

بیست ساڵی دووەم لەژێر سایەی سەرۆك ( سەدام حسین )دا بوو هیواداریین لەمەو دواش ئاسۆی ڕۆشنبیری کوردی گەشترو ڕوناکتر بێت .

ئەبینین لەبیستی یەکەمدا شار هەبووە لەکوردستاندا هیچ تیپێکی هوونەری تیانەبوە، بەلام لەبیستی دووەمدا زیاتر لەدە تیپی هونەری هەبوە، لەبیستی یەکەمدا هیچ دەزگایەکی رۆشنبیری نەبوە ......

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ . ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ٣٤. دوالاپەرە .

## جەژنی شانۆو شانۆی ئێمە

**یاسین قادر بەرزنجی**

هەموو ساڵێ لەسەرەتای وەرزی بەهاری سەوزماندا، هەفتەیەك دوای نەورۆزی دێرینمان، یادێکی شیرین ئەکەینەوە یادی ڕۆژی شانۆی جیهانی، ئەو ڕۆژە ڕوناکەی کەلەسەرانسەری جیهاندا بووە بە جەژنی هونەرمەندانی شانۆ، لەبیستو حەوتی ئازاری ئەمساڵیشدا، شانۆکاری کوردی بەوپەڕی شانازیەوە پیرۆزبایی لەخۆیانو لەجەماوەری هاندەری بەرهەمیان دەکەن .

کەواتە جێگای خۆیەتی بەهەموو شێوەیەك یارمەتی هوونەرمەندانی کورد بدرێت، ڕێزی شایەن بەخۆیان بگیرێت، ئەمەش لەگەڵ تێڕوانینی سەرۆکی فەرماندە ( سەدام حسین )دا تەبایە بەرانبەر بە هونەرمەندان و ئەدیبانو ڕوناکبیران لەم نیشتیمانەدا، چونکە لەزوەوە سەرۆکی فەرماندە فەرموویەتی : هونەرمەندان وەك سیاسی وان هەر یەکەیان بەجۆرێك ژیان ئەخولقێنن، ئەمڕۆ دەوڵەت درێخی ناکات لەو تیپانەو بەرهەمیانو یارمەتیەکی باشیان ئەدات .

چونکە دەوڵەتو لێپرسراوان بەباشی لەوە گەیشتون کەبەرهەمی شانۆکاری کورد لەپێناوی نیشتیماندایە، شانۆگەریەکان لەهەموو وەرزێکداو بەتایبەتی لەساڵانی جەنگی سەپێنراو بەسەر وڵاتماندا .

بەرهەمی ئەوتۆ بون کەداکۆکییان لەخاكو نەتەوەو مرۆڤی ئەم عێراقە سەربەرزە کردوە .

تێبینی :ڕۆژنامەی ئاسۆ ساڵی ١٩٩٠. ژمارە ٣٦. دوالاپەڕە .

## خۆری تەمموز بەفو ناکوژێتەوە

کەمال ڕۆوف محەمەد

ئێمە لافو گەزافی ئەو چەنە بازو چاوچنۆکو دزو جەردەو پیاوکوژانە لەکۆنەوە دەناسینو دەشزانین کەتاقە مەبەستیان هەر مەبەستەکەی جارانە، دەیانەوێ خۆری ڕوناکی عێراق خۆری تەمموز بەفوو بکوژێنەوە .

هەیهوو هەیهوو خەیاڵ پلاوان باسەر بدەن لەبەرد، عێراقی نوێ عێراقی یەك ماڵەو یەکگرتو، عێراقی کوردو عەرەبی جوتەبرا، عێراقی ملیۆنەها شەهیدی کۆن‌ونوێ، عێراقی عەجەم بەزێن، ئینگلیز بەزێن، جوو بەزێن، عێراقی بیروباوەڕوو توانـاو چەکی کارامەو دانسقە .

عێراقی سەرکردەی تاقانە ( سەدام حسین ) ی دڵسۆزی بێ هاوتا، هەرگیزاو هەرگیز ڕێنادات ئەو فوەشیان لەگەرودا بێ هەموو لەسەنگەردانو لەسەر پێین، هەتاهەتایشە خۆری عێراق هەر ڕوناك دەبێ‌وخۆری تەمموز ناکوژێتەوە و دوژمنـان دەسوتێن شەمشەمە کوێرە چۆن دەرەقەتی خۆر دێ،

وەلامیش هەر لەئێستاوە دەنگی دەڕوا تادەگاتە ڕابردوو، وەلامیش هەرئەوەیە، چونکە عێراق ولاتی خێرو پیتو بەرەکەتە، ولاتی خۆرو ئاو هەوای پاکە .

ولاتی بیرو توانای باوەڕە، پایتەختی شارستانیو زانستو خوێنەواریو پیاوەتیە بێشەی مەردی چاك و کارامەوشۆڕە سوارە .

تێبینی : ڕۆژنامەی ئاسۆ. ساڵی ١٩٩٠، ژمارە ٤٢. دوالاپەرە .

## چەند قسەیەك سەبارەت بە مستەشارەكان

پرسیارێك لێرەدا كەڕوبەڕووی من دەبێتەوە ئەوەیە بۆچی نـاوی مـستەشارەكان‌و ناوی قەڵەمەكانی بەعس كە دوو تایپی جیاواز بـوون‌و پێكـەوە هەریەكـەو لەشـوێنی خـۆی خزمـەتی بـە بـەعس دەكـرد لـەناو كتێبێكـدا تێكـەڵ كـراون ؟ ڕەنگـە ئەمـە پرسـیارێكی قبـوڵ بێـت بـەچ حەقێكمـەوە كەسـێكی ئـەنفال كـەر تێكـەڵ بكـەم بـە قەڵـەمێكی بـەعس كـە ئـەنفالی نـەكردوە، هەڵبەتـە بوونـە بەعـسی جۆرێكـە لـە ڕەد كردنەوەی كورد، ئەو كوردەی توانیبێتی بەعس قبـوڵ بكـات دەبێـت دان بەوەشـدا بنێت كەسیستەمێكی قبوڵ كردوە هەموو هەوڵی ئەو سیستەمە ئەوەبوو كۆتایی بـە میلەتێك بهێنێت كەناوی كوردە .

قەڵەمەكانی بەعس پێكهاتون لەوانەی لەناوەندی ڕۆشنبیریدا كاریان كـردوە، ئـەم تایپە نەیان توانیوە بچنە ناو بەرەكانی جەنگەوەو ئامادەی خۆیان پیشان بدەن بـۆ لەناو بردنی هاوزمانەكانیان، بەڵام شتێك كە هەموویان كۆدەكاتـەوە واتـە بەعـسی‌و مستەشارو قەڵەمی بەعس تەنها حزبی بەعسە، ئەو قەڵەمەی لەماڵەكەی خۆیدا بیری كردوەتەوە بەعس قبوڵ بكاتو شتێكی گونجاوی لەڕۆژنامەیەك یان بڵاو كراوەیەك بۆ بڵاو بكاتەوە لەتەك ئەو بەعسیەدا چ جیاوازیەكی هەیە كەئامادەبووە لەپێناوی ئـەو حیزبەدا هاونیشتیمانیانی كورد ئەنفال بكات .

مـن جیاوازیەكـە تـەنها لـەوەدا دەبیـنم وەزیفـەكانیان جیـاوازە، ڕۆشـنبیرە بەعسیەكان هەمیشە هەوڵیان داوە بەجۆرێك وێنەی بـەعس بنەخـشێن كەوێنەیـەكی جوان‌و فریشتە ئاسابێت لای خەڵك، دروست كردنـی ئـەم جـۆرە دەمامكـە بۆبـەعس لەڕێگەی قەڵەمەكانی بەعسەوە جیاوازیەكی وای نیە لەتەك ئەتك كردنـی نەتەوەیـە، بەعسێك بەهـەموو ناشـیرینی خۆیـەوە قبـوڵی بكـەیت و دواجـار بێیـت شـێوەیەكی جـوانی بۆبنەخـشێنی تـا ئـەو پرسـە جینۆسـایدانەی خـۆی بـرەو پێبـدات ئەمـە كارەساتێكە عەیبە گەورەكەی لەسەر شانی قەڵەمەكانی بەعسە .

لەو ڕۆژەی مستەشارەكان لەتەك هاوڕێ بەعسیەكانیاندا خەریكی ئەنفال كردنی كورد بوون هەر ئەو ڕۆژە ڕۆشنبیرێكی قەڵەمی بەعس بەهەموو هێزی بیركردنەوەی خۆیەوە وتارێكی نایابی لەپێناو كارە جوانەكانو مەزنی بەعسدا دەنووسی، ئەو ڕۆشنبیرەش بەهەمان شێوە لەئەنفالدا بەشداربوو، بەلاّم لەڕێگەی تفەنگەوەنا بەڵكو لەڕێگەی قەڵەمە بەدبەختەكەیەوە كەلەخزمەتی بەعسدا بوو .

بۆیە تێكەڵكردنی ئەم دوو تایپە لەناو كتێبێكدا ناكاتە ئەوەی من گوناهێكم كردبێت، ئەمانە كۆمەڵەكەسێكن دەبێت دواجار لێپێچینەوەیان لەتەكدا بكرێتو ئەو زەمەنەی كوردیان لەبیركردبوو خۆیان دابویە دەست هێزێكی جینۆسایدكەر لەبیریان بهێنرێتەوە.

ئەم مستەشارانەی كەلەم كتێبەدا ناوم نووسیون زۆربەیان لەڕۆژنامەو بلاّو كراوەكانی دوای ڕاپەڕین ناویان بلاّو كراوەتەوە، بۆیە بەپێویستیشم نەزانی بەڵگە نامە كانیان لەگەڵدا بلاّو بكەمەوە تەنها لەبەرئەوەی پێشتر هەموومان ناومان لەناو لاپەرەی ڕۆژنامەكان بینیون .

دیارە هەرچۆن قەڵەمەكانی بەعس ئێستە زۆربەیان پلەی بەرپرسیاریەتیان هەیەو هەندێك جاریش كوردایەتیمان پێدەفرۆشن، بەهەمان شێوە بەڵكو بەزیاتریشەوە مستەشارەكان زیاتر ڕێزیان لێدەگیرێتو پلەی بەرپرسیاریەتیان گەیشتوەتە ئاستێك تەحامول نەكرێت، هیوادارم دەسەلاّتی كوردی هیچ نەبێت كەمێك بەخۆیدا بچێتەوەو چارەیەكی ئەو دەردە بكات كە برینی ئەنفال كراوەكان هەمیشە زیاتر دەكات پلەدانە بەو مستەشارانە، لەوانەشە ئەم مستەشارانە تیایاندابێت توانیبێتی لەكاتی ئەنفالدا خەڵكانێك ڕزگار بكات، بەلاّم ئەمە ناكاتە ئەوەی كە ناوی نەنوسرێتو بەرانەت نامەی بۆ بلاّو بكرێتەوە، بەپشت بەستن بەقسەكانی خۆیان لەناو بلاّو كراوەكانی بەعسداو بەدان پیانانی خۆیان من هەستاوم پۆلێنی ئەم ناوانەم كردوەو خستومەتە ناو دوو توێی كتێبێكی دیكۆمێنتی لەم شێوەیە .

١_ لەتیف ئەحمەد زێباری

٢_ سابیر ڕەفیق سورچی

٣_محەمەد كەریم زێباری

٤ _ ئیبراهیم عەلی حاجی مەلۆ

٥ _ عاسف ئەحمەد زێباری

٦ _ سەعید یونس زراری
٧_فەتاح کریم جاف
٨_ سادق زێرۆ هەرکی
٩_ تاریق فاتیح کاکەی
١٠_مەدحەد تۆفیق داودی
١١_مامەند محەمەد مەولود گەردی
١٢_ چیای دیوالی دۆسکی
١٣_سوعاد فەیزولاّ تالّەبانی
١٤_ تاریق شەفیع نوعمان کافرۆش
١٥ _ موعتەسەم عبدوالکریم حوسێن بەرزنجی
١٦ _ رەفعەت محەمەد عەلی گلی
١٧_محەمەد عەلی حەسەن شەمێرانی
١٨_ کیسرا محەمەد سەعید جاف
١٩ _ ڕەشید حەمەئەمین
٢٠ _ عەبدوالکریم ئەلکەسنەزانی
٢١ _تاهیر عەلی جەباری
٢٢_ محەمەد عیسا جاف
٢٣ _ ئیبراهیم نەسرولاّ
١٤ _ محەمەد تاهیر زیناوە
٢٥_خەلیل ئیبراهیم شەریفانی
٢٦ _ ئەنوەر محەمەد ڕەزا جاف
٢٧ _ خزر فەتاح حوسێن قامیش
٢٨ _شێخ نەجمەدین شێخ صالّەح بەرزنجی
٢٩ _ تەحسین شاوێس سەعید
٣٠ _محەمەد سەعید هارونی
٣١ _محەمەد ڕەشید جاف
٣٢ _شێخ تەیب شێخ ئوسمان جاف
٣٣ _شێخ ڕەزا تەها مەحیەدین

٣٤_ عەدنان عەبدولاّ نەجم جاف
٣٥_ مەحەیدین شێخ عەزیز بەرزنجی
٣٦_ سەعید محەمەد غەریب جاف
٣٧_حەسەن مەحمود هورقانی
٣٨ _ سدیق عەلی محەمەد ئەمین
٣٩_نەوزاد ئەنوەر خۆشناو
٤٠ _ ئیسماعیل مەحمود ڕەسولّ ئاغا پشدەری
٤١_ هەمزە عەباس مامەند ( ئاکۆ ) خالید شێخۆ موراد
٤٢ _ شاکر عەبدوالسەمەد
٤٣_ شێخ محەمەد ئەحمەد ڕەشید
٤٤ _ جەلال چەرمەگا
٤٥_ مەحمود حەمەرەسولّ ئاغا پشدەری
٤٦_ مەجید بایز حەسەن بەرزنجی
٤٧_ کەریم عەبدولاّ محەمەد
٤٨_عەباس حاجی ئاغا ڕەسولّ
٤٩_شێخ ڕەشید ئەنوەر میران
٥٠_موقەدەم تاریق سەعید ئیبراهیم
٥١_مەحمود حەمەئەمین حەمەگولی
٥٢_فوئاد کەریم محەمەد هەمەوەندی
٥٣_سەعید ئەسعەد شێتنە
٥٤_قادر سوارئاغا بلّباس
٥٥_ محەمەد عومەرئەمین باسکای
٥٦_ فارس تاهیر مستەفا غەفوری
٥٧_ عوسمان عومەر مام یەحیا
٥٨_ عەباس بایز بلە
٥٩_ خالید مەحمود ئەحمەد عەلی غەوارە
٦٠_ جەمال فەقێ حسێن کەلهوڕی
٦١_ ڕەسولّ مامەند فیرودلّی

٦٢_ عومەر حەمە ڕۆستەم
٦٣_ سەباح سەعید کەریم هاواری
٦٤ _ عومەر بابەکر سەلیم ئاغا پشدەری
٦٥_ مەحمود ئەحمەد شەریف غەوارە
٦٦_ ئیبراهیم کانی بالۆ
٦٧_ محەمەد عەلی بچکۆل
٦٨_ عەبدولا حەسەن سالح بابان
٦٩_ محەمەد ئەحمەد بچکۆل
٧٠_ خزر ڕەشید بەحری
٧١_ بایز عەزیز ڕەشید
٧٢_عەلی ئەوڕەحمان کوڕانی
٧٣_ سوارە فەتاح فەرەج
٧٤_ تۆفیق سلێمان یاسین
٧٥_ حەمید نوری خورشید هەرکی
٧٦_عەلی شێخ ئەمین فەرەج
٧٧_ حوسێن سورچی
٧٨_ ئەسعەد هەرکی
٧٩ _ فەخری ئیسماعیل عەبدولقادر
٨٠_ شەریف محەمەد کەرداوی
٨١_ قاسم کەریم ئەحمەد شنك ( قاسم ئاغا )
٨٢_ کەمال محەمەد مام سۆرانی
٨٣- غەفور دۆلبێشکی
٨٤-شێخ فەخری ئیسماعیل ڕەژگەی
٨٥-ئەحەمەد جەمیل ئەمین
٨٦-قادر عەبدولا سالح \ جێگر موستەشار.
٨٧-فاروق ڕەشید عەلی
٨٨- شێخ محەمەد عومەر ڕەشید

دەبێت لەکۆتایدا ، زۆر سوپاسی ئەو بەرێزانەبکەم کە توانیان ئەرشیفی خۆیان بدەن بەدەستمەوە تاکو بتوانم ئەو ناوانە بدۆزمەوە کە لەناورۆژنامەو گۆڤارەکانی بەعسدا هەبوون .

هەڵبەتە ئەم کتێبە بەهاوکاری چەند هاورێیەکم بەچاپ گەیاندراوە، من زۆرسوپاسیان دەکەم کەتوانیان پێکەوە پارەم بۆکۆبکەنەوەو کتێبەکە چاپ بکەین.